

ڕۆمان

ئێرنێست هێمنگوای

# پیرەمێرد و زەریا

عیسا عوسمان

لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی





براوەی خەڵاتی نۆبڵی ساڵی ١٩٥٤

# پیرەمێرد و زەریا

ئێرنێست هێمینگوەی



**وەرگێڕانی: عیسا عوسمان**

پێداچوونەوە: کەیوان هەورامی




**ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان**

بەڕێوەبەری گشتی: ئاراس مەلا محەمەد

**ناونیشان:** سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، قولکەی گۆزەکان نزیک ناوەندیی ڕۆژهەلاتی کوڕان.

**پەیوەندی:** 07701974856 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369

**Email:** bookadiban@gmail.com

**Facebook:** https://www.facebook.com/eadiban/

## ناسنامەی کتێب

**ناونیشان:** پیرەمێرد و زەریا.

**نووسەر:** ئێرنێست هێمینگوەی.

**وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە:** عیسا عوسمان.

**بابەت:** ئەدەبیاتی سەدەی 20 زایینی.

**پێداچوونەوە:** کەیوان هەورامی.

**ژانر:** ڕۆمان.

**بەخشانگە:** ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان.

**ساڵی چاپ:** 2019 میلادی.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (1992) ساڵی (2019) پێ دراوە، ئەم کتێبە لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبانە، 

# پێشەکی

ئێرنێست هێمینگوەی لە ساڵی ١٨٩٩دا لە «ئۆک پارک»ی ویلایەتی ئیلینۆس لە دایک بووە. هەر زوو و لە تەمەنێکی کەمدا ڕاوکردن لە باوکییەوە فێر بوو و ئاکاری بەرز و دابونەریتە ئایینیەکانیش لە دایکیەوە. هێمینگوەی بە درێژایی تەمەنی ژیانێکی سەخت و سەرکێشانەی پڕ لە ڕووداو و پێشهاتی سەیر و ناجۆری بەسەر برد. لە ساڵی ١٩٢١دا بۆ یەکەم جار دەبێتە ڕۆژنامەنووس و دواتریش لە کۆتاییەکانی جەنگی جیهانیدا وەک شۆفێری ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن دەچێتە بەرەکانی جەنگ. هەر لەوێ چەندین جار بە سەختی بریندار دەبێت و ناچار چەند نەشتەرگەرییەکی بۆ دەکرێت، وەلێ هەر لە پای ئەم هەوڵ و تێکۆشان و خزمەتانەدا پلەیەکی بەرزی سەربازیی وەک ڕێزلێنانێک پێ دەبەخشرێت. سەروەختی مانەوەی لە نەخۆشخانەدا، دەکەوێتە داوی ئەوینی کچێکی پەرستارەوە و تا ماوەیەک لەگەڵ یەکدی پەیوەندییان دەبێت، وەلێ ئەفسووس پەیوەندییەکە بەو جۆرە کۆتایی نەهات کە هێمینگوەی دەیخواست و کچەکە بەجێی دەهێڵێ و، کاریگەریی سەختی ئەم دابڕانەش لە هەندێک لە کتێبەکانیدا ڕەنگ دەداتەوە. دەکرێ بڵێین کۆی ڕووداوەکانی ژیانی، کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆیان لەسەر ئەدەبی هێمینگوەی هەبووە و بە جۆرێک لە جۆرەکان، ڕووبەڕووبوونەوەی خۆی بەرانبەر نەهامەتییەکانی ژیان، ئەزموونەکانی جەنگ، کوشتن، وێرانکاری، ئەوین، ڕاو، شاخوداخکردن و کۆی پێشهاتەکانی

دیکەش، پاشخانێکی مەعریفی و پاڵنەرێکی سەرەکیی ئەو بوون بــۆ نووســـین و هەنگـــاو هەڵهێنـــان بەرەو دونیـــای ئەدەب. هێمینگوەی لاوێکی جوانخاس بووە و بە قەدوقامەتی ڕێک و لەشـولارێکی پـتەو و بەهێـز ناسـراوە، ئەمە جـگە لەوەی کە وەرزکارێکی جددی و خۆشتاقەت بـووە و بە وردی پابەنـدی بەرنـامە و ڕێنمـاییە وەرزشـییەکانی یـاریی بۆکسـێن بـووە. لە لایەکی دیکەشـەوە گەڕان و ئەزمـوونکردنی سرووشـت و ڕاو بووبـووە سـەرگەرمیی هەمیشـەیی ئەو. سـاڵی ١٩٢١دا وەک پەیامنێر لە «تۆرێنتۆ ستار» دەستبەکار دەبێت و هەر لەوێش بە یەکەم هاوسـەری داهـاتووی خـۆی شـاد دەبێـت بە نـاوی «هـادیلی ڕیچاردسـۆن». لە دوابەدوای ئەمـانەدا هێمینگـوەی وەک پەیامنێر دەچێتە فەڕەنسا و ماوەیەک لەوێ دەمێنێتەوە و بە چەندین کەسایەتیی بەناوبـانگی جیهـانی وەک *مۆسـۆلینی* و *پابلۆ پیکاسۆ* ئاشنا دەبێت، کە بێ گومـان لەو کاتەدا فەڕەنسـا لە ترۆپکی ئەدەب و سـەردەمی زێڕینیی هـونەری خۆیدا بـوو. بەڵام دەرکەوتـــن و ئاشـــنابوونی خەڵكـــی بە هێمینگـــوەی دەگەڕێتەوە بۆ سـاڵی ١٩٢٣ کە یەکەم کۆمەڵە چیرۆکی خۆی بـڵاو کردەوە و بەمەش تـا ڕادەیەکی بـاش بە خـوێنەرانی ئەو سـەردەمە ناسـێنرا. وەلـێ دەکـرێ ئـاوڕدانەوەی جـددیی ڕەخنەگـران و ئەدەبدۆســتان و خــوێنەرانی ئەمریکــا بــۆ هێمینگوەی بگەڕێنینەوە بۆ سـاڵی ١٩٢٦؛ کاتێک کە یەکەمـین ڕۆمـانی خۆی بە نـاوی «خۆریش بە هەمـان شێوە هەڵدێت» بـڵاو کـردەوە و پێشـوازییەکەی باشـی لـێ کـرا. خۆشـی و شـادییەکانی هێمینگـوەی تـا سـەر درێژەیـان نەکێشـا و پـاش گەڕانەوەی بۆ فلۆریدا، بۆ لای خێزانەکەی، بـاوکی ئەو، خۆی

دەکوژێت و ئەمەش کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر هێمینگوەی دادەنێت و دەبێتە گرێی سەر دڵی، بە جۆرێک کە لە قۆناغەکانی داهاتوویدا بە زەقی کاریگەریی ئەم ڕووداوەی باوکیی پێوە دیار دەبێت. لەنێوان ساڵانی ١٩٣٦-١٩٣٨دا وەک پەیامنێرێک بۆ دامرکاندنەوەی شەڕی نێوخۆیی ئیسپانیا کار دەکات و ئەمەش هەلێک دەبێت بۆ ئەو تا بە ئاشکرا داخی دڵی خۆی بەرانبەر فاشیست و نازییەکان دەربڕێت و دژایەتییان بکات. پاش ئەمانە، هێمینگوەی دەچێتە کوبا و لە خانووە تایبەتەکەی خۆیدا بۆ ماوەیەک دەمێنێتەوە و ڕۆمانێکی دیکەی بەناوبانگ و گرنگی خۆی بە ناونیشانی «براوە بە دەستی خاڵی دەگەڕێتەوە» دەنووسێت و سەرباری ئەمانەش جێی باسە کە بڵێین مانەوەی لە کوبا، کاریگەریی لەسەر ڕەوتی نووسین و گرێچن و ڕشتەی ئەدەبی هێمینگوەی دەبێت. تا دواتر ڕۆمانی «زەنگەکان بۆ کێ دەزرینگێنەوە» بڵاو دەکاتەوە و بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو و لە ئەندازە بەدەر، پێشوازیی لێ دەکرێت و لە ماوەی کەمتر لە ساڵێکدا، یەک ملیۆن دانەی لێ دەفرۆشرێت، کە ژمارەیەکی پێوانەیی مێژووی تۆمار دەکات بۆ ئەو سەردەمە. هەر زوو و دواتریش داوای لێ دەکرێت کە کاری دەرهێنانی بۆ بکرێت و وەک فیلمێک بە خوێنەران و خەڵکی ئاشنا بکرێت، لەبەرانبەر فرۆشتنی مافی کتێبەکە و ڕێگەدان بە دەرهێنانی وەک فیلم، بڕی سەدوپەنجا هەزار دۆلار وەردەگرێت. لێرەدا هەرچەند قسە لەسەر هێمینگوەی بکەین کەمە و ناهەقیمان بەرانبەر ماندووبوون و هەوڵەکانی کردووە لە ژیانیدا، بە جۆرێک کە ناکرێت باس لە ئەدەبیاتی ئەمریکی بکەین بەبێ ناوهێنانی

هێمینگـــوەی. هەرچەنـــد شـــوێنکەوتوان و لاســـاییکەرەوانی هێمینگوەی زۆر بوون، وەلێ هیچیان نەیانتوانی جێگەی ئەو پڕ بـــکەنەوە و جـــۆرە ئەدەبێـــک بـــخەنە بەر دیـــدەی خـــوێنەران، هاوشێوەی ئەدەبی هێمینگوەی تۆکمە و بەهێز و کورتبڕ بێت.

هێمینگوەی لەنێو خوێنەرانیدا وەک کەسێکی بوونگەرا ناسراوە و، کاریگەریی ئەم ڕەوتە فکرییەش بە زەقی لە بەرهەمەکانیدا ڕەنگـــی داوەتەوە. بە جۆرێـــک کە پرســـــە ســـــەرەکی و وجوودییەکانی مرۆڤ لە ژیاندا دەورووژێنێت، وەک: ئامـانجی ژیـان چییە و بـۆچی هەیـن! بەرەو کوێ دەچـین و گەوهەری خولقاندن و هـاتنەبوونی مرۆڤ لە چ شـتێکدایە؟ ڕاسـتییەکەی ژیان لە خۆیدا مانایەکەی نییە و خۆ گەر مانایەکیشی هەبێ، ئەوە خۆمـان داوەمانەتە پاڵی و ئەمەش بە تێپەڕبوونی کات لە مێشکی مرۆڤەکانـدا دەڕەوێتەوە و کەسـەکە دەکەوێتەوە نێو هەمان بۆشـایی پووچی ژیانەوە. واتە مرۆڤ ناکرێ تـا سـەر، هەر لەنێو وەهمێکی تـایبەت بە خۆیدا بژی کە سـازی داوە و هـیچ پەیوەنـدییەکی سـەرەکی و قـووڵی بە جەوهەری بـوونی ئەوەوە نییە. هەڵـبەت دەکرێ بڵێین ئەمـانە پرسـیارگەلێکن کە زۆرێک لە بیرمەندان و فەیلەسوفانی بـوونگەرای وەک *ئەلبێر کـامو* و *سـارتەر* لە ســەردەمی خۆیانــدا وروووژانــدوویانن. سارتەر پێی وابوو کە پرسی بوونی مرۆڤ، لەپێش جەوهەری خـودی مـرۆڤەکە خـۆیەوە دێت. هەرچـی ئەلبێـر کاموشــە، بە وردی و تێروتەسەلی تاوتوێی ئەم جۆرە پرسانەی کردووە و دەکرێ لەم سـۆنگەیەوە کتێبـی *ئەفسـانەی سـیزیف*ــەکەی بە یەکێک لە باشترین کتێبەکانی لە قەڵەم بدەین. چونکە سـیزیفی کامو بە جۆرێک لە جۆرەکان بووبووە سیمبول و شێوەیەکی

گشتیی تاکی سەدەی بیست. چەندین فەیلەسوفی دیکەش لێرە و لەوێ جەخـــت لەســـەر ئەوە دەکەنەوە، کە کـــردار و چالاکییەکانی مرۆڤ، تەنها ڕێگەچارەیەکی ناچارانەی مرۆڤن بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کە لە ئەنجامی نەبوون یان دەرنەکەوتنی خوداوە خوڵقاوە، وەک چۆن نیتچەش دەیگوت: *خودا مردووە و ئێمە کوشتمان!*

زۆر دوور نەکەویــنەوە و بێیــنەوە ســەر باســی ئەوەی کە هێمینگوەیش بیروبۆچونەکانی سەبارەت بە ژیان و بوونی مرۆڤ بەدەوری فەلسەفەی بوونگەراییدا دەخوولێنەوە، بە تایبەت بوونگەرایی نیهلیستی. هەڵبەت وەک پێشتریش باسمان لێوە کرد، زۆربەی زۆری نووسینەکانی هێمینگوەی و جەوهەری فەلسەفەکەیان، لە ژیانی ڕاستەقینەی خۆیەوە سەرچاوە دەگرن، ئەمەش وا دەکات کە نووسینەکانی زیاتر واقیعی دەر بکەون، چونکە هەڵهێنجراوی ژیانی خۆیین. لێرەدا گرنگە بڵێین کە فەلسەفەی هێمینگوەی لەسەر ئەوە دەوەستێ، کە تاک پێویستە سیستەمێکی وەها لێوانلێو لە بڕوا و بوێری دورست بکات، کە بە ئاسانی نەهامەتییەکانی ژیان ملی پێ نەدەن و بە هەموو توانای خۆیەوە بکۆشێت و هەرگیز کۆڵ نەدات و بوونی ڕاستەقینەی خۆی و مرواری ژیانی لە گەرمەی ئەم کێشمەکێش و بەرەنگارییانەدا بدۆزێتەوە. بێ لە ڕۆمانەکانی، چیرۆکەکانیشی سیخناخن لە جوانیی دارشتن و گێڕانەوە و وروژاندی پرسەگەلی گرنگی ژیان، بە تایبەت چیرۆکی «بەفرەکانی کالیمانجارۆ»ی کە بە قووڵی چووەتە نێو وردەکاری و پرسیارەکانی مرۆڤ سەبارەت بە بوون و ژیان. هەر لەم ڕووەشەوە دەکرێ لێکچوونێکی زۆر هەبێ لەنێوان

هەندێ کەسایەتیی نێو کتێبەکانی کامو و هێمینگوەی، چونکە وێڕای ئەوەی سیزیفیش بەئاگایە لەوەی کە تاهەتایە بەردەکە ناگەیێنێتە ترۆپک و کارەکەی تەواو ناکات، کەچی کۆڵ نادات و هەمـوو جارێـک بە ورەیەکـی بەرز و سەرسـەختانەترەوە سـەری دەخـات، چـونکە پێـی وایە کە پرسـی خۆشـبەختی و جـوامێری و شـکۆ و شـەرەف، بـێ لەوەی کە دەرەنجـامێکی کۆشش و هەوڵی مرۆڤ بن بۆ بەدەستهێنیان، هیچی دیکە نین!

خوێنەری ئازیز، ئەم ڕۆمانەی بەردەستت، تەنها کتێبێکی نێو دونیای ئەدەب نییە، بەڵکو یەکێکە لە شاکارە ئەدەبییەکەن، کە لە ساڵی ١٩٥٤دا بڵاو کراوەتەوە و نووسـەر لەپای جوانی و ئاستبەرزیی ئەم ڕۆمانە خەڵاتی نۆبلی پێ بەخشرا. هەڵبەت قسـەکردن لەسـەر وردی و جـوانیی گێـڕانەوە و نـاوەڕۆکی ڕۆمـانەکە کـاتێکی زۆر دەخایەنێـت و، بە قسـەی چەنـد کەسێکیش نەبووە بە یەکێک لە باشترین ڕۆمانەکان. بەڵکو بە درێژایـی مێـژوو لەلایەن ڕەخنەگـر و کەسـی شـارەزای نێـو دونیای نووسین و ئەدەبیات هەڵسەنگێنراوە. *سانتیاگۆی* پیر، کەسایەتیی سەرەکیی ڕۆمانەکە، ڕاوچییەکی بەتەمەنە و وا بۆ هەشتاوچوار ڕۆژ دەچێ، کە چارەڕەشی بە جۆرێک بەرۆکی گرتووە کە وا دیارە هەر وا بە ئاسانی بەری نادات. سانتیاگۆ کەسێکی خاوەن ئەزموون و وردە لە کارەکەیدا، وەلێ بەهۆی بەدبەختی و ئەو گەمەیەی کە سرووشت و ژیان پێی دەکەن، بە جۆرێک لە جۆرەکان لەنێو ڕاوچییەکانی دیکەدا ناوی زڕاوە. هەر بۆیەش بڕیار دەدا بەرەو پانتایی زەریا، دوور لە هەمـوو ئەوانی دیکە ملی ڕێ بگرێت و ماسییەکی گەورە ڕاو بکات... دەکرێ بڵێین ئەم کتێبە ڕۆمـانێکی دەروونییـە، کە لە ڕێـی

خۆدواندنی ناوەکی و دەرەکییەوە، کەڵکەڵە و ختوورەکانی دەروون و ناخی مرۆڤمان لە زۆر لایەنەوە بۆ ڕوون دەکاتەوە، جا چ ئایینی بێت یان فەلسەفی. هەروەها ئەمە ڕۆمانێکی سیمبولییە، واتە ئاماژە تێیدا دەستێکی باڵای هەیە و هەر تەنێک، کەرەستە یان کەسایەتییەک تێیدا کراوە بە ئامـاژەی پرسێکی گرنگ و قووڵ، کە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ نووسەر بۆمان شی دەکاتەوە. فەلسەفەی هێمینگوەی لەم ڕۆمانەدا وەک چۆن باسمان کرد، فەلسەفەی خۆبنیادنان و کۆڵنەدانە، مرۆڤ دەکرێ هەمیشە لەلایەن سرووشتەوە تێک بشکێت و ملی بۆ پێشهاتە سرووشتییەکان، کە لە سەرووی توانای ئەوەوەن، کەچ بکات، وەلێ هەرگیز نابەزێت! هیوا و ئارەزووی نەبەردی سیفاتگەلێکن کە لەگەڵ لەدایکبوونی هەر مرۆڤێکدا دێنە ئاراوە، یان با بڵێین کە دوانەیەکن بە وجوودی مرۆڤەوە بەستراون. سانتیاگۆی پاڵەوانی ئێمەش، بەهۆی هەندێ پێشهات و بارودۆخەوە، کە دەکرێ وەک ڕووە ئایینیەکەی بە قەدەر لێکدانەوەی بکەین، دووچاری شکست هاتووە، وەلێ هەرگیز نووشووستی زەفەری پێ نەبردووە، چونکە شکست و نووشووستی لە هیوای مرۆڤێکدا دوو پرسی تەواو جیان. لێرەدا سانتیاگۆ نموونەیەکی باڵای مرۆڤە؛ نموونەیەک کە لەو ڕووەوە باڵایە کە ئەم مرۆڤە دەرک بە توانا و بوونی خۆی دەکات لەنێو سرووشتدا و بەردەوام لە ململانێدایە لەگەڵی، سرووشتێک کە بەردەوام مرۆڤ تێک دەشکێنێت، بەڵام ئامانج و ئەرکی مرۆڤەکەشە کە دووبارە هەستێتەوە و بە ورەیەکی زیاترەوە بەرەو ئامانجەکەی هەنگاو بنێت. دەکرێ تۆ ناوی بنێیت ئامانج،

من پێی دەڵێم ململانێی ژیان، چونکە هەر لە بنەڕەتەوە ژیان بەرز و نزمی و ململانێیەک بووە، کە زۆر کات ململانێکە لە ناخی مرۆڤدا دەکات. لێرەدا گرنگ نییە کە ئەم کێبڕکێیە چۆن کۆتایی دێت، چونکە سبەی نەزانراوە و هەموو ئەوەی تێیدا دەژین ئێستەیە، هەر بۆیەش گرنگ پاراستنی ئەو دەستکەوتە نییە کە بۆی دەکۆشین، گرنگ بەدەستهێنانیەتی، خۆشی لە خودی ئامانجەکەدا نییە، بەڵکوو لە پڕۆسەی گەیشتن بە ئامانجەکەدایە. پاڵەوانەکانی هێمینگوەی هەردەم کەسانێکن، کە ئەوانی دیکە ڕزگار ناکەن، بەڵکو لە سرووشتدا ململانێی ڕزگاربوونی خۆیان دەکەن. جەنگی کەسایەتییەکانی هێمینگوەی، جەنگێکە بۆ دۆزینەوەی جەوهەری خۆیان و بەرەنگاربوونەوەیان لەگەڵ ژینگەکەی دەوروبەریاندا. واتە کەسانێکن لە ململانێیەکی بەردەوامدان بۆ سەلمانی خودی خۆیان، جا ئەم سەلماندن و سەرکەوتنەش هەروا سانا نییە و گەلێک لایەن و ڕێگەی هەیە بۆ پێگەیشتنی، کە ئەگەر ورد سەرنج بدەین، لەم ڕۆمانەدا نووسەر یەک بە یەک سەرنجی خستوونەتە سەر، چ پرسە ئایینەکان، چ کاریگەریی دەرموە لەسەر مرۆڤ. چۆن سرووشت دەکرێت بە هاندەرێک؟ چۆن دەکرێت ئێمە کەسێک بکەینە سەرمەشق و نموونەی خۆمان، تا لە ڕێیەوە وزە و تاقەتی خۆمان بدۆزینەوە؟ ئەمانە و چەندین پرسیاری گرنگی دیکەش، کە تەنگ بە مرۆڤ هەڵدەچنن لە گەرمەی هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی خەونەکەیدا. زیاتر ئەم پێشەکییە درێژ ناکەمەوە و لە کۆتاییدا شرۆڤەیەک بەجێ دەهێڵم، کە زیاتر کتێبێکە بە تایبەت لەسەر ***پیرەمێرد و زەریا*** نووسراوە و من ناوی دەنێم شرۆڤە، کە بە دڵنیاییەوە

پارمەتیدەرێکی باش دەبێت بۆ خوێنەر، تا بە کەشی کتێبەکە، فیکر و ئەدەبی هێمینگوەی ئاشنا ببێت و گرێکانی نێو ڕۆمانەکە بە ئاسانی بکاتەوە.

عیسا عوسمان

٢٠١٩/٨/٢١

پیرەمێردێک هەبوو کە بە تاقی تەنیا و لە بەلەمێکدا بەسەر ئاوی *گوڵف ستریم*ەوە[1]، ڕاوەماسی دەکرد. ئەوە هەشتاوچوار ڕۆژی ڕەبەق بوو ماسییەکی نەگرتبوو. لە چل ڕۆژی سەرەتادا کوڕێژگەیەک یاوەریی دەکرد، وەلێ پاش تێپەڕبوونی چل ڕۆژ و ڕاونەکردنی هیچ ماسییەک، دایبابی کوڕێژگەکە بە کوڕەیان گوت، گومان لەوەدا نییە کە پیرەمێردەکە لە کۆتاییدا بووەتە سالۆ، کە خراپترین جۆری چارەڕەشی و شوومییە، جا هەر بەپێی فەرمانی ئەوان لە بەلەمێکی دیکەدا دەستبەکار بوو و هەر زوو لە یەکەمین هەفتەیدا سێ ماسیی چاکی ڕاو کرد. کوڕە زۆر دڵگران و خەمگین بوو کە دەیبینی پیرەمێردەکە هەموو ڕۆژ بە دەستی بەتاڵ دەگەڕێتەوە، وەلێ هەموو جار دەستوبردێکی دەکرد، خێرا دەچوو بەدەمییەوە و لە هەڵگرتنی قولاپە گرمۆڵەکراوەکان، نێزە، چارۆگە لە ئەستوون پێچراوەکە و گوچانە قولاپییەکەیدا کۆمەکی دەکرد. چارۆگەکەی شڕوشیتاڵی نەمابوو و لە چەندین لاوە بە پارچەی گونییەئاردی کۆن پینە کرابوو، هەر لە ئالایەکی بەزیو و شکستەی ئەبەدی دەچوو.

[1] Gulf stream: تەوژمە ئاوێکی ئۆقیانووسی گەرمە، درێژەپێدەری تەوژمی یەکسانەهێڵی ئۆقیانووسی ئەتڵەسییە. وەک چۆن تەوژمەئاوی یەکسانەهێڵی باکووری تێکەڵ بووە، پاش پێکدادانی بە کەنارەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەمریکای باشووردا. بەرەو کەنداوی مەکسیکی دەبێتەوە و لەوێشەوە بە ئاراستەی باشووری ڕۆژهەڵات بە تەک کەنارەکانی بەریتانیادا ڕادەبورێت، تاکو هێڵی ٤٢ی پانی باشوور، کە لەوێوە لەژێر کاریگەریی بای باشووردا، بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە.

پیرەمێردەکە جەستەیەکی لەڕ و لاوازی هەبوو، چەند چرچ و لۆچییەک کەوتبوونە پشتەملیەوە و کۆمەڵێ پەڵەی قاوەییش کە لە دەرئەنجامی تیشکدانەوەی خۆری سەر زەریاکەوە دروست بووبوون و بە شێرپەنجەی پێستی بێوەی ناسرابوون، هەردوو لای ڕووخسارییان تەنیبوو. دەستەکانی شەقارشەقار بووبوون و چەندین جێبرینی قووڵیان پێوە دیاربوو کە لە ئاکامی دابرینی ئەو پەت و گوریسانەوە چێ بووبوون کە ماسیی گەورەگەورەی پێ ڕاکێشابوون، وەلێ هیچ یەک لەم برینانە تازە نەبوون و کۆن بوون، هێندەی بیابانێکی کاکی بە کاکی وشکوبرینگ، کە بە تەمەنی ماسییەکی بە خۆیەوە نەدیتبێ کۆن بوون.

بێ لە چاوەکانی هەموو ئازای جەستەی پیر و کەنەفتە دەینواند، ڕەنگی چاوانی کتومت بە ڕەنگی زەریا دەچوون و تا بڵێی درەوشاوە و نەبەزیو دەردەکەوتن. بەلەمەکەیان لە کەناردا لەنگەر دا و بەدەم هەڵگەڕان بەسەر هەورازی کەنار ئاوەکەدا کوڕەکە گوتی:

- سانتیاگۆ! دەتوانم دووبارە لەگەڵتدا بێمەوە، هەندێ پارەمان چنگ کەوتووە.

پیرەمێردەکە کوڕەی فێر ڕاوەماسی کردبوو، کوڕەکەش بە تەواوی هۆگری بووبوو و خۆشی دەویست. پیرەمێرد گوتی:

- ئێستە لە بەلەمێکی بەبەختدا کار دەکەی، باشترە هەر لەوێ بمێنیتەوە.

- بەلام ئەوەشت لە یاد بێ کە پێشتر هەشتاوحەوت ڕۆژت بەسەر برد بێ ئەوەی یەک ماسیش ڕاو بکەی، دواتر دەرچەی

بەختمان کرایەوە و هەموو ڕۆژێ بەردەوام تا سێ هەفتە ماسیی گەورەگەورەمان لێ ڕاو دەکردن.

پیرەمێرد گوتی:

- باش بیرمە! خۆ دەزانم جیابوونەوەت لە من، خوانەخواستە لە ئەنجامی گومانخراپی و دڵکرمێییەوە نەبووە.

- باوکم ناچاری کردم جێت بهێڵم، خۆت دەزانی هێشتاکە منداڵم و دەبێ گوێڕایەڵی بکەم.

پیرەمێرد گوتی:

- دەزانم، ئەوە شتێکی تەواو ئاساییە.

کوڕە گوتی:

- ئەو کەمبڕوایە.

پاشان پیرەمێردەکە گوتی:

- نا! وەڵێ ئێمە بڕوامان پتەو و بەهێزە ئەی وا نییە؟

- بەڵێ وایە، حەز دەکەم لە بانیژەکە[1] بیرەیەکت بۆ بکڕم، دەڵێیت چی؟ دواتریش کەلوپەلەکان دەبەینەوە ماڵێ.

پیرەمێردەکە وەڵامی دایەوە:

- بۆ نا؟ هەر لەنێو ماسیگرەکانیشدا هەڵی دەقۆڕێنم.

لە بانیژەکە دانیشتن، هەندێ لە ماسیگرەکان کەوتنە لاقرتێ و گاڵتەکردن بە پیرەمێردەکە، وەڵێ ئەو هەر بە بای خەیاڵیشیدا

[1] بانیژە: سەکۆی دانیشتن، بەرهەیوان، شوێنی دانیشتن لە قاوەخانەدا.

نەدەهات. هەرچی ماسیگرە بەتەمەنەکانیش بوون، تەماشایان دەکرد و بەزەییان پێیدا دەهاتەوە، وەلێ ئەم بەزەیی و حەسرەتەیان دەرنەدەخست. بەڵکو دەکەوتنە باسوخواسی شەپۆلە دلگیرەکان و ئەو ئاوە قووڵانەی کە ڕۆژانێک قولاپیان تێ هاویشتبوون، کەشوهەوای ساز و دلگیری بەردەوام و گشت ئەو شتانەی کە ڕۆژگارێک بینیبوویانن. ئیدی ئەو ماسیگرانەشی کە ڕسقی ڕۆژەکەیان حەلاڵ کردبوو، پێشوەختە لەوێ سکی ماسییەکانیان هەڵدڕیبوو. دواتریش دەیانخستنە سەر دوو پارچە تەختە و دوو پیاو لەمسەر و لەوسەرەوە تەکەتەک بەرەو ماسیگەکەیان دەبردن، لەوێندەریش چاوەڕوێ دەبوون تا سەیارەی بەفرەکە دەگەیشت و دەیگواستنەوە بۆ بازاڕی *هاڤانا*. ئەوانەش کە قرشیان ڕاو کردبوو، دەیانگواستنەوە بۆ کارگەی قرشەکانی ئەوبەری کەنداوەکە، تا لەوێ بخرێنە سەر بەرزکەرەوەکان و ئەشقەمەیان[1] دەربهێنرێت، پەڕەکانیان ببڕدرێن، پێستەکەیان داماڵرێت و سەرئەنجامیش سوێر بکرێن.

هەر جارێک با لە خۆرهەڵاتەوە هەڵی بکردبا، بۆنوبەرامەی کارگەی قرشەکان بەندەرەکەی دەتەنییەوە، وەلێ ئەمڕۆ با لە باکوورەوە هەڵی کردووە و تەنها هەست بە سووکەبۆنێک دەکرێت، هێندەشی نەخایاند بە جارێک سرەوت و کپ بووەوە. کەشوهەوای خۆرەتاوی و لەباری بانێژەکەش تەواو خۆش و دلگیر بوو.

کوڕەکە گوتی:

---

[1] ئەشقەمە: ورگی گیاندار کە هێشتا پیسییەکەی تێدا فڕێ نەدرابێت.

- سانتیاگۆ!

پیرەمێرد وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ!

پەرداخەکەی بە دەستەوە بوو، بیر و خەیاڵی نیشتبووەوە سەرساڵانی ڕابردووی تەمەنی.

- دەکرێ بچم هەندێ ماسی سەردینت[1] بۆ بهێنم، تا بەیانی بیانکەی بە چەشە؟

- نا، بڕۆ یاریی بەیسبۆڵ بکە، هێشتاکە بەشی ئەوەم بە بەرەوە ماوە سەوڵ لێ بدەم، ڕۆجێریش کەمێکی تر تۆڕەکە هەڵدەدا.

- زۆر حەز دەکەم بڕۆم، وەلێ کە ناتوانم یاوەریت بکەم بۆ ڕاو، دەمەوێ بە جۆرێ لە جۆرەکان هیچ نەبێ یارمەتییەکت بدەم.

- بیرەیەکت بۆ کڕیوم، لەوە زیاتر چی! پێشوەختە بوویتەتە پیاوێکی پیاوانە و ماقووڵ.

- چەند ساڵان بووم کاتێ بۆ یەکەم جار سواری بەلەمت کردم؟

---

[1] Sardine: جۆرە ماسییەکە لە ئۆقیانووسی ئەتڵەسیدا دەژی، وەک چۆن لە هەندێ بەشی خۆرئاوایی دەریای سپیی ناوەڕاستدا هەیە و، لە خۆرهەڵاتی بە شێوەیەکی بەرچاو کەمترن. یەکەم جار ناونرا سەردین، چونکە لە نزیک دوورگەی سەردینیای خۆرئاوایی دەریای سپیی ناوەڕاستدا ڕاو کرا.

- پێنج سالان بووی، هەر خەریکبوو تیا بچی. ئەو دەمەی ماسییەکەم ڕاکێشایە ناوەوە هێشتا گیانی دەرنەچووبوو، زۆری نەمابوو بەلەمەکە هەلاهەلا بکا. خۆ لە بیرتە؟

- بەلێ بیرمە. هەر کە کلکی دا بە جێگەی سەوڵێدانەدا وردوخاشی کرد. زرموکوتی پێداکێشانەکانی کلکیشیم لە یادە، ئەوەشم لەبیرە کە فڕێت دامە پێشکوی بەلەمەکە، لای کلافەی پەتە خووساوەکان، ئەودەم هەستم دەکرد سەراپای بەلەمەکە دەلەرزی، گوێیم لە زرمەی پێداکێشانەکانی تۆش بوو، بەربووبوویتە گیانی و دەتگوت بە تەور لە قەدی درەختی دەدەی، جا بۆنی شیرینچکی خوێنەکەش، کە بە چواردەورمدا دەپڕژا.

- هەر بە ڕاست تۆ هەموو ئەوانەت بیرە یان خۆم بۆم باس کردووی؟

- لە یەکەمین جارمانەوە کە پێکەوە ڕۆیشتین، تا ئێستە هەموو شتێکم بیرە.

پیرەمێردەکە بە دوو چاوی لێوڕێژ لە بڕوا و سۆز - چاوانێک کە هەتاوگاز[1] بووبوون - تەماشایەکی کرد و گوتی:

- گەر کوڕی من بوویتایە لەگەڵ خۆم دەمبردی و بیباکانە خۆمان دەدایە دەست چارەنووس، وەلێ ئەفسووس، کوڕی دایبابی خۆتی و لەم نێوەندەدا هیچبەدەستم، هاوکات لە بەلەمێکی بەبەختیشدا کار دەکەی.

---

[1] هەتاوگاز: تاوەسووت: خۆربردوو: شتێک کە خۆر سووتاندبێتی.

- ئێستە سەردینەکانت بۆ بهێنم؟ دەتوانم چوار چەشەت بۆ پەیدا بکەم، شوێنەکەیان پێدەزانم.

- هێشتا ئەوانەی ئەمڕۆم ماون، لە سندووقێکم ناون و خوێم بەسەردا کردوون.

- با بڕۆم و چوار دانەی تەڕ و تازەت بۆ بهێنم.

پیرەمێرد گوتی:

- هەر یەک دانە بهێنە بەسە.

لەخۆڕابینی و ورەی پیرەمێردەکە هەرگیز تووشی نوشووستی نەبووبوو، بە پێچەوانەوە، ئێستاکە بە چەشنی هەڵکردنی شەماڵێک تا دەهات زیاتر دەبووژایەوە.

کوڕەکە پێداگریی کرد:

- نەخێر، دووان دەهێنم.

- باشە، با قسەی تۆ بێ، خۆ نەتدزیون؟

- خۆت دەزانی گەر ناچار بام دەستم لە دزینیان نەدەگێڕایەوە، وەلێ ئەمانە خۆم کڕیومن.

پیرەمێردەکە گوتی:

- سوپاس.

لەوە دڵسافتر بوو بیر بکاتەوە و لە خۆی بپرسێت، خێرە! لە کەیەوە فێری ئەم ملکەچی و گوێڕایەڵییە بووە، وەلێ دەیزانی کە تازە فێری بووە و چ شەرمێکی تێدا نییە و، زیان بە شکۆ و جوامێریی ڕاستەقینەی ئەو ناگەیەنێت. پاشان گوتی:

- دوای ئەم تەوژمانە، سبەی کەش تەواو خۆش و لەبار دەبێ.

کوڕە پرسیی:

- تەمای کوێت هەیە؟

- تا چاو بڕ بکا دەڕۆم، بۆ ئەوەی پێش گۆڕانی ئاراستەی با بگەڕێمەوە، دەمەوێ بەر لەوەی دونیا ڕووناک دابێ، بەڕێ بکەوم.

- منیش هەوڵ دەدەم کەڵکەڵەی چوونە پانتایی زەریا بخەمە سەری خاوەنکارەکەمەوە، تا گەر هاتوو ماسییەکی گەورەت ڕاو کرد زوو بێین بەدەمتەوە و دەستبارێکت بدەین.

- ئەو کەیفی بەوە نایەت بەرەو پانتایی زەریا مل بنێ و دوور بکەوێتەوە.

کوڕە گوتی:

- ڕاستە، هەوڵ دەدەم شتێ لە دوورەوە بەدی بکەم کە ئەو نەتوانێ ببینێ، با بڵێین باڵندەیەک کە لە دوور شتێکی گیر هێناوە، جا پاشان بە کەوتنە دووی *دۆلفینێک* دەیخەڵەتێنم.

- یانی بەو جۆرەش بینایی کز و لاوازە؟

- کەم تا زۆر کوێرایی داهاتووە.

پیرەمێردەکە گوتی:

- سەیرە، خۆ قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان کیسەڵی ڕاو نەکردووە، تەنها ئەوە چاوی مرۆڤ کز دەکا.

- بەلام خۆ تۆ چەندین ساڵ خەریکی ڕاوەکیسەڵ بووی لە کەناری مێشردا، ئەوەتا چاوەکانیشت هەروەک هی بازێک دووربین و ساغن.

- من پیرەمێردێکی نائاساییم.

- پێت وایە تینوتاو و هێزی گرتنی ماسییەکی گەورەت مابێ، قەستم دانەیەکی زۆر گەورەیە؟

- لە خۆم ڕادەبینم، سەربارى ئەوەش هەر فێڵ و تەڵەکە زۆرە.

کوڕە گوتی:

- جارێ با ئەم کەلوپەلانە بەرینەوە ماڵێ، ئەوجا دەتوانم تۆڕی تایبەت بە وردەماسییەکان بەرم و بچمە سۆراخی سەردینەکانم.

کەرەستەکانی نێو بەلەمەکەیان گرمۆلە کردن، پیرەمێردەکە ئەستوونەکەی دا بە شانیدا و کوڕەش سندووقی ئەو کلافە بەیەکداپێچدراوانەی هەڵگرت، کە گرێی توند توندیان لێ درابوو، لەگەڵ نەیزە و گۆچانە قولاپییەکەدا. سندووقی چەشەکانیش لە پشتەوەی بەلەمەکە و لە پەنای کوتەکەکەدا دانرابوو، جا ئەم کوتەکە تایبەت بۆ کوتین و تەمبێکردنی ئەو ماسیانە دروست کرابوو کە ڕادەکێشرانە ناوەوە و بە ئاسانی ملیان نەدەدا. هیچ کەس کەلوپەلی ئەو پیرەمێردەی نەدەدزی، وەلێ بۆ ئەوەی شەونم زیان بە چارۆگە و پەتە ئەستوورەکان نەگەیەنێت، باشتر وابوو بیانباتەوە ماڵێ، گەرچی پیرەمێردەکە لە خەڵکی ئەو دەر و ناوە خاترجەم بوو کە شتەکانی نادزن،

وەلێ ختوورەیەک بە دڵیدا هات و بیری کردەوە، گەر گۆچانە قولاپی و نەیزەکە جێ بهێڵێت، کێ ناڵێ یەکێک چاویان تێ نابڕێ و نایانبات.

دووبەدوو بەرەو کوختی پیرەمێردەکە کەوتنە ڕێ و بە دەرگا واڵاکەیدا چوونە ژوورێ، پیرەمێرد ستوون و چارۆگە تێوەپێچراوەکەی بە دیوارەکەوە هەڵسپاردن، کوڕەش سندووق و شمەکەکانی دیکەی خستنە پەنایانەوە. درێژیی کوڵەکەکە کەم تا زۆر باتەقای درێژیی کوخێک دەبوو. کوختەکە لەو مادە ڕەقە درووست کرابوو کە پێیان دەگوت *گوانو* کە بێ لە گەڵا خورمای *شاهانەی*[1] لەسەریەکهەڵچنراو چیی تر نەبوو. ژوورەکە تەختەخەو و مێز و کورسییەکی تێدابوو، لەگەڵ کونجێکی پیسوپۆخڵ لەسەر زەوییەکە، کە بە خەڵووز چێشتی تێدا لێدەنرا. بەسەر ڕووی دیوارە ڕەنگبزڕکاو و قاوەییەکەوە کە لێرە و لەوێ چەند گەڵایەکی *گوانوی* ڕەقی تێکئاڵاو سەریان دەرهێنابوو، دوو وێنەی ڕەنگاوڕەنگ هەڵواسرابوون. یەکێکیان وێنەی *دڵی مەسیح*[2] و ئەوی دیکەشیان وێنەی

---

[1] Royal palm: ناوە زانستییەکەی «roystonya regia». یەکێکە لە جۆرەکانی دارخورما، کە لە بنەچەدا، دارخورمایەکی مەکسیکییە. قەدێکی باریکی هەیە و نزیکەی ٢٠-٣٠ مەتر گەشە دەکات. تۆوەکەی وەک سەرچاوەیەکی ڕۆن و خۆراکی ئاژەڵ بەکار دەبرێن، گەڵاکانی بۆ داپۆشینی بانی کوخت و خانوو، قەدەکەشی بۆ بنیاتنانی خانوو و شوێنی نیشتەجێبوون سوودی لێ دەبنرێت، هەروەها ڕەگەکانیشی وەک دەرمانێک بۆ نەخۆشیی میزگیران لە لایەن خەڵکیەوە کەڵکی لێ وەدەگیرێت و هاوکات لە هەندێ شوێنیشدا بۆ چارەسەری نەخۆشیی شەکرە بەکار دەبرێ.

[2] Sacred heart of jesus: وێنەی دڵی مەسیح؛ وێنەیەکی پیرۆزە لە پەرستگە کاسۆلیکییەکاندا، هەروەها لای هەندێ گرووپی مەسیحیی دیکە، کە

مریەمـــی پـــاکیزە بـــوو، ئەمـــانەش پاشـــماوە و یـــادەوەریی هاوسەری کۆچکردووی بوون. ڕۆژانێک وێنەی ڕەنگاوڕەنگی هاوسەرەکەی بەم دیوارەوە کردبوو، وەلێ هەر جار سەرنجی دەچـــووەوە ســـەری، بـــارێکی خەم و تەنیـــایی و بێکەســـی سەراپای دادەگرت. هەر بۆیەش ناچار بە دیوارەکەوە دایگرت و خستییە سەر ڕەفەی سووچەکە و لەژێر کراسە خاوێنەکەیدا هەڵی گرت.

کوڕەکە پرسیی:

- چیت هەیە بیخۆی؟

- مەنجەڵێک برنجی زەرد، لەگەڵ ماسی. حەز دەکەی هەندێکی لێ بخۆی؟

- نا، لەماڵەوە نان دەخۆم. دەتەوێ ئاگرەکەت بۆ هەڵکەم؟

- نـا دواتـر خـۆم دەیـکەم، ڕەنـگە بـرنجەکە هەروا بە ســاردی بخۆم.

- دەتوانم تۆڕی وردەماسییەکان بەرم؟

- بێ گومان.

پیرەمێـردەکە هـیچ تـۆڕێکی ڕاوەماسـیی نەبـوو، کـوڕەکەش بە باشی ئەو کاتەی لەبیر بوو کە فرۆشتی. وەک چۆن دەیزانی کە هـیچ مەنـجەڵە بـرنج و ماسـییەکیش لە ئـارادا نیـیە، وەلـێ

---

ێلـی مەسـیح نیشـان دەدات، وەک ئامـاژەیەک بـۆ سـۆز و خۆشەویسـتی بەتینی عیسای مەسیح بۆ خەڵکەکەی. سەرەتای بیرۆکەکە دەگەڕێتەوە بۆ ســەدەکانی ناوەڕاسـت، وەلـێ دەگـرێ بڵـێن لەســەر دەسـتی قەشــەژنی فەرەنسیی «مارگریتا ئەلاکوک» ناسێنرا.

تێکــڕای قســەکان بەشــێک بــوون لەو نمایشــە چکــۆلە پێکەنینئــامێزەی کە دووبــارە و دووبــارە هەمــوو ڕۆژێــک دەیانگێڕا. پاشان پیرەمێردەکە گوتی:

- هەشــتاوپێنج ژمــارەیەکی بەختهێــنە، چــی دەڵێــی گەر لەوســەرەوە بە خــۆم و بەلەمەکەوە بگەڕایــنەوە و ماســییەکم ڕاوکردبێ کە هەزار ڕەتڵ زیاتر بێ؟

- تــۆڕەکە دەبەم و دەچــمە ڕاو، تــۆش حەز دەکەی بــڕۆ و لە پێشکۆی کوختەکەدا کەمێ خۆت بدەرە بەر خۆر و دابنیشە.

- هەروا دەکەم خەمت نەبێ. ڕۆژنامەکەی دوێنێم لایە، گەلێک کەیفم بە خوێندنەوەی ڕۆژنامەی بەیسبۆل دێ.

کــوڕەکە دڵنیــا نەبــوو لەوەی کە ئەم ڕۆژنــامەیەش بەشــێکە لە نمایشەکەیان یاخود نا، وەلێ پیرەمێردەکە دەستی کرد بە ژێر قەرەوێڵەکەدا و دەری هێنا. پاشان ڕوونکردنەوەی دا:

- بریکۆ پێی دام، لە *بودیگا*.

- هەروەخــت ســەردینەکانم دەســت کەوتــن دەگەڕێــمەوە، بەشــەکەی هەردووکمــان لە بەفــرەکەدا هەڵدەگرم و بــۆ ڕۆژی دواتــر بەشــیان دەکەیــن، جــا کە هــاتمەوە دەتــوانی باســی بەیسبۆڵم بۆ بکەی.

- مەحاڵە *یانکییەکان* بدۆڕێن.

- بەلام من ترسم لە *هندەکانی کلیفلندە*.

- بــڕوات پــتەو و بەهێــز بــێ بە یانکییەکــان کــوڕم، بیــر لە *دی ماگیوی* مەزن بکەرەوە.

- له یەک کاتدا له هەردووکیان دەترسم، پڵنگەکانی *دیترۆیت* و هیندەکانی *کلیڤلەندیش*.

- وریـا بە، ئەگینـا له سـوورەکانی *سینسـیناتی* و گـۆرەویە سپییەکانی *شیکاگۆش* دەترسی.

- تـۆ شـەنوکەوی بـابەتەکە بکە و، کە هـاتمەوە هەمـوویم بـۆ باس بکە.

- پێت چۆنە بلیتێکی یانسیب بکڕین کە بە ژمـارە هەشـتاوپێنج کۆتایی هاتبێ؟ ئاخر سبەینێ هەشتاوپێنجەمین ڕۆژە.

کوڕەکە وەڵامی دایەوە:

- ئەمەش بۆ خۆی بیرۆکەیەکە، وەلێ چی دەڵێی سەبارەت بە ژمارە هەشتاوحەوت، ژمارە پێوانەییەکەی خۆت؟

- دووبارەبوونەوەی مەحاڵە، تۆ بڵێی بلیتێکمـان دەسـت بکەوێ بە هەشتاوپێنج کۆتایی هاتبێ؟

- دەتوانم دانەیەک داوا بکەم.

- دەیەکی پەڕەیەکە نرخەکەی، کە دەکاتە دوو دۆلار و نیو، جا ئەم برە پارەیە لە کێ قەرز بکەین؟

- کارێکی ئاسانە، قـابیلە یەکێک نەدۆزمەوە دوو دۆلار و نیوم باتێ.

- پـێم وایە منـیش دەتـوانم، وەلـێ ئەسـڵی مەسـەلەکە ئەوەیە نـامەوێ بکەومە ژێـر بـاری قەرزوقـۆڵەوە، پیـاو هەر ئەوەنـدە فێـری قەرز بـوو، بـۆ ڕۆژی دواتـر فێـری دەسـتپانکردنەوە و سواڵیش دەبێ.

- باش خۆت داپۆشە باپیرە! بیرت نەچێ لە مانگی ئەیلولداین.

- مانگی هاتنی ماسییە گەورەکانە، ئیدی هەموو کەس دەتوانێت لە *مایس*دا ببێتە ماسیگر.

کوڕەکە گوتی:

- با بچم بە لای سەردینەکانەوە.

کاتێک کوڕە گەڕایەوە، خۆر بە تەواوی ئاوا بووبوو. پیرەمێردەکە لەسەر کورسییەکە خەوی لێکەوتبوو. کوڕەکە پەتووە سەربازییە کۆنەکەی لەسەر تەختەخەوەکە هێنا و شانوملی پیرەمێردەکەی پێ داپۆشی. شانەکانی تا بڵێی عەنتیکە و سەیر بوون! گەرچی خاوەنەکەیان پیر بوو، کەچی هێشتاش هەر بەهێز و تۆکمە مابوونەوە. ئەو ساتانەشی پیرەمێردەکە بە سەری نەویییەوە خەوی لێ دەکەوت، چرچولۆچییەکانی پشتەملی دەرنەدەکەوتن. کراسەکەی بەریشی مەگەر هەر خوا بزانێ چەند جار پینە کرابوو، وەک چارۆگەی بەلەمەکەی لێهاتبوو، جا پینە و پەڕۆکانیش بە جۆرێک خۆربردە و کاڵ بووبوونەوە کە هەزار ڕەنگ دەیاننواند. بیچم و سەروکەللەی گەلێک پیر و کەشەنگ دەهاتە پێشچاو، بە جۆرێک کە لەم ساتەدا چاوانی نووقاندووە، ئەوەی پێی بڵێیت تروسکایی و سیمای ژیان لە ڕووخساریدا بەدیی ناکەیت. هەروا بە پێخاوسی لێی خەوتبوو و ڕۆژنامەکەش لەسەر ئەژنۆکانی گیرسابووەوە و لەژێر قورسایی مەچەکیدا مت بووبوو و نەیدەهێشت شنەبای ئێواران جمەی[1] پێ بکات.

---

[1] جمە: جوولە؛ جموجۆل.

کوڕەکە هەر بەو جۆرە وازی لێهێنا، پاشان لێیدا و ڕۆیشت. کە گەڕایەوە بینیی هێشتا نووستووە، بانگی کرد:

- مامەپیرە هەستە!

کوڕەکە ئەمەی گوت و دەستێکی لەسەر ئەژنۆی پیرەمێردەکە دانا.

پیرەمێرد چاوی هەڵهێنا، تاوێک هەروا وەک ئەوەی لە سەفەرێکی دووردرێژەوە گەڕابێتەوە واقی وڕما، جا زەردەیەک نیشتە سەر لێوانی و پرسیی:

- ئەوە چییە پێت؟

- خواردەمەنییە، شێو دەخۆین.

- من زۆر برسیم نییە.

- دەی وەرە نانەکەت بخۆ، خۆ ناکرێ بە زگی خاڵییەوە بچیتە ڕاو.

- خەمت نەبێ، ڕۆژگاری لەو جۆرەشم زۆر دیوە.

ئەمەی گوت و هەستا بە لوولکردنی ڕۆژنامە و قەدکردنی پەتۆکەی.

کوڕە گوتی:

- پەتۆکە باش بپێچە بە خۆتدا، تا من مابم نایەڵم بە زگی خاڵییەوە بچیتە ڕاو.

پیرەمێردەکە گوتی:

- کەوایە تەمەنێکی درێژ بژی و بە باشی ئاگاداری خۆت بە، چیت هێناوە بیخۆین؟

- ماشەڕەشە و برنج و مۆزی برژاو و بڕێک گۆشتی کوڵاو.

کوڕەکە لە سەفەرتاسێکی دوو چێندا لە بانیژەکەوە هێنابوونی، دوو چەقــۆ، دوو چنگــاڵ، دوو کەوچکیشـــی لە کــاغەزێکەوە پێچابوون و بە دوو بەشی جیاجیا کردبوونییە گیرفانی.

- کێ ئەمانەی پێدای؟

- مارتین، خاوەنی بانیژەکە.

- دەبێ سوپاسی بکەم.

- پێویست ناکا، من لەبری تۆش سوپاسم کرد.

- کەوایە هەرکـات ماسـییەکی گەورەم ڕاوکـرد بڕێـک گۆشـتی چاکی سکەکەی بۆ دەنێرم، ئەوەندەی من بیرم بێ گەلێ جاری تریش شتی بۆ ناردووین، ئەری؟

- بەڵێ، وابزانم.

- کەواتە گۆشـتێکی باشـتر لە هــی سـکی بـۆ دەنێـرم، خــوا هەڵناگرێ پیاوێکی بەخشندە و دەستکراوەیە.

- دوو شووشە بیرەشی بۆ ناردووین.

- من حەزم لە بیرەی قوتوە زیاتر.

- دەزانم، وەڵێ چار چییە! لە شووشەدان، ئەمە بیرەی جۆری *هاتوی*یە. دەبێ شووشەکانیشی بۆ بەرمەوە.

پیرەمێردەکە گوتی:

- ئەمەیان لە بەخشندەیی خۆتەوەیە. چییە دەست بکەین بە خواردنی؟

- بەڵێ لەوەدابوو داوات لێبکەمەوە. خۆم سەفەرتاسەکەم نەکردەوە، گوتم نەوەک ئامادە نەبێ.

پیرەمێردەکە گوتی:

- من ئامادەم، تەنها ویستم دەستوپلێک بشۆم.

کوڕە لە دڵی خۆیدا گوتی: «لە کوێ دەیشۆیت؟» ئاوەکە دوو کۆلان دوورترە لە کوختەکەوە. «دەبوو بڕێک ئاوم بۆ بهێنایە، لەگەڵ سابوون و خاولییەکیشدا، ئای چەندە مرۆڤێکی هێڕ و بێئاوەزم، هەر ئەوەندەش نا، بەڵکو کراس و پاڵتۆیەکی گەرموگوڕی زستانی و جووتێک پێڵاو و پەتۆیەکیش.»

پیرەمێردەکە گوتی:

- بە ڕاستی ئەم گۆشتە کولاوەت بەلەزەتە.

کوڕە گوتی:

- باسی یارییەکانی بەیسبۆڵم بۆ بکە.

پیرەمێرد بە ڕوویکی خۆشەوە گوتی:

- هەروەک پێشتر پێم گوتی، لە یانە ئەمریکییەکاندا، یانکییەکان بێڕکابەرن.

- بەڵام خۆ ئەمڕۆ دۆڕان.

- ئیدی یارییه و دۆڕانیشی تێدەکەوێ، وەلێ ئەمە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ، چون *دی ماگیۆی* مەزن گەڕاوەتەوە ئاستی جارانی.

- خۆ یاریچیی دیکەش هەن لە تیپەکەدا.

- بێ گومان، وەلێ وەک ئەو ڕۆڵێکی گرنگیان نییە و جیاوازییەک دروست ناکەن. لە یارییەکەی نێوان *بروکلین* و *فیلادلفیا*، هاندەری بڕۆکلین دەبم، گەرچی ناتوانم بیر لە لێدانە مەزنەکەی *دیک سیسلەر* نەکەمەوە لە یاریگە کۆنەکەدا.

- بە تەمەنم هیچ یاریچییەکم نەبینیوە لەو دوورتر تۆپ بهاوێ.

- بیرت دێ ئەها جاران دەهاتە بانیژەکە؟ دەمویست لەگەڵ خۆمدا بیبەمە ڕاوەماسی، وەلێ شەرم و کەمڕوویم ڕێگر بوو. پاشان پەنام بردە بەر تۆ تا داوای لێ بکەی، کەچی سەیر دەکەم تۆ لە من ویرانتری!

- دەزانم، ئەوە هەڵەیەک بوو چاوپۆشیی لێ ناکرێ، خۆ ئەگەری هەبوو کە بێ! لە بارێکیشدا گەر بهاتایە، یادگەرییەکی وای بەجێ دەهێشت کە تا دونیا دونیا بوو بیرمان نەدەچووەوە.

پیرەمێرد گوتی:

- ئای چەندە خوازیارم دی ماگیۆی مەزن ببەمە ڕاو. دەڵێن باوکی ماسیگر بووە، ڕەنگە هەروەک ئێمە بێلانە و گەدا بووبێ. دەکرا ئەو لێمان تێبگا.

- باوکی *سیسلەری* مەزن هەرگیز دەردی هەژاریی نەچەشتووە، ئەو لە تەمەنی مندا بەژداریی یارییە گەورەکانی دەکرد.

- کاتێ لە تەمەنی تودا بووم، لە پێشکۆی بەلەمێکی چارۆگەداردا وەستابووم و بە کەنارەکانی ئەفریقادا دەسووڕامەوە، دەمەوئێوارانیش سەروەختی تاریک داهاتنی دونیا، شێرەکانی ڕۆخ زەریام دەدی.

- دەزانم، بۆت باس کردووم.

- کەواتە لەسەر چی بدوێین؟ ئەفریقا یاخود بەیسبۆڵ؟

کوڕەکە وەڵامی دایەوە:

- پێم خۆشە بەیسبۆڵ بێ. باسی جۆن ج. *ماک گراوی* مەزنم بۆ بکە.

کوڕەکە لەبری ئەوەی بڵێ «جەی» وتی گوتا.

- جاروبار سەردانی بانیژەکەی دەکرد، وەلێ قسەڕەق و جنێوفرۆش بوو، هەر بۆیەش ئەو کاتانەی بەدمەست بوو کەس خۆی لە قەرەی نەدەدا. چەند بیری بەلای بەیسبۆڵەوە بوو، ئەوەندەش بەلای پێشبڕکێی ئەسپەوە! هەمیشە گیرفانەکانیی بە لیستی ناوی ئەسپ ئاخنیبوون، سەری زمان و بنی زمانی باسوخواسی ئەسپ بوو. تەنانەت لە پەیوەندییە تەلەفۆنییەکانیشیدا هەر باسی ناوی ئەسپ و ئەم بەزموڕەزمانەی دەکرد.

کوڕە گوتی:

- ڕێکخەرێکی مەزن بوو، ئەوەی ڕاستی بێ باوکم پێی وایە کە مەزنترین ڕێکخەری مێژووە و کەس شان لە شانی نادا.

- تەنیا لەبەر ئەوەی ئاموشۆی ئێرەی زۆر دەکرد! گەر هەموو ساڵێک دورۆشێریش سەردانی ئێرەی بکردایە، ئەوساکە باوکت ئەویشی بە مەزنترین ڕێکخەر دادەنا.

- ئەی کێ بە ڕاستی ڕێکخەرێکی مەزنە؟ *لوک* یان *مایک کونزالێز*؟

- بە ڕای من هەردووکیان وەک یەکن.

- ئێ باشترین ماسیگریش کێیە قابیلە! هەر تۆی.

- وا نییە، کەسانێکی دیکە دەناسم کە لە من باشترن.

کوڕە گوتی:

- que va[1]، ماسیگری بەتوانا زۆرن، وەلێ کە دێتە سەر مەزنەکان بە پەنجەکانی دەست دەژمێردرێن، هەرچۆنێ بێ کەس ناگاتە تۆ.

- سوپاس، تۆ شادمانم دەکەی، هیوادارم ماسییەکی ئەوەندە گەورە و بەهێز نەبێ بە تووشمانەوە کە بە درۆمان بخاتەوە.

- گەر هێشتاکە لەسەر شەنگ و گوڕوتینی جارانت مابی، ماسییەکی لەو جۆرە بوونی نابێ!

- دەشێ بەو جۆرەش بەهێز نەبم کە بیری لێدەکەمەوە، وەلێ فرۆفێڵی زۆر شک دەبەم و خاوەن بڕیاری خۆمم.

---

[1] بە زمانی ئیسپانی واتە «مەحاڵە».

- ئێستە پێویستە بنووی، تا بەیانی خەواڵوو نەبی و چوستوچالاک بێدار بیتەوە، منیش شتەکان دەبەمەوە بانیژەکە.

- کەواتە شەوشاد، سبەی زوو دێم بەئاگات دێنم.

کوڕەکەش گوتی:

- تۆ کاتژمێرە بێدارکەرەکەی منی.

پیرەمێردەکەش وەلامی دایەوە:

- پیریش بووەتە کاتژمێری بێدارکەرەوەی من. سەر لەوە دەرناکەم بەساڵاچووان بۆ زوو بەئاگا دێن؟ دەکرێ لەبەر ئەوە بێ کە ڕۆژێکی درێژتر بەسەر بەرن و کاتێکی زیاتریان بۆ بمێنێتەوە!؟

کوڕەکە وەلامی دایەوە:

- نازانم، ئەوەندە دەزانم کوڕیژگەکان تا درەنگانی شەو ناخەون و بۆ بەیانییەکەشی بە ئەستەم بەئاگا دێن.

- خەمت نەبێ بیرم ناچێ، لە کاتی خۆیدا بەئاگات دێنم.

- حەز ناکەم بەیانیان ئەو هەڵم بستێنێ، چونکە ئەوکات هەست دەکەم بێ لە بارگرانییەک هیچی تر نیم.

- دەزانم.

- باش بخەوە مامەپیرە.

کوڕە کوختەکەی جێ هێشت، هەر لەنێو تاریکیی چڕ و ئەنگوستەچاوی شەو و بێ هەڵکردنی هیچ ڕووناکییەک لەسەر مێزەکە، نانەکەیان خواردبوو. پیرەمێرد پانتۆلەکەی داکەند، جا

لوولی کرد و بۆ ئەوەی بیکاتە سەرین، ڕۆژنامەکەی ترنجاندە ناوی و، هەروا بەنێو تاریکییەکەدا بەرەو تەختەخەوەکەی هەنگاوی هەڵگرت. دواتر خۆی لە پەتۆکەوە ئالاند و لەسەر ئەو ڕۆژنامە کۆنە ڕزیوانە ڕاکشا کە زەمبەلەکی تەختەخەوەکەیان داپۆشیبوو.

هێندەی نەخایاند خەوی لێکەوت، خەونی بە ئەفریقاوە دەبینی، بە ڕۆژانێکەوە کە ئەوکات مێرمندالێک بوو، بە ڕۆخە ئالتوونییەکانی ئەفریقاو و بەو کەنار ئاوانەوە کە بە ڕادەیەک سپی و بێگەرد بوون ڕەونەقیان ئاوی لە چاو دەهێنا. خەونی بە ملە و بەندەنی شاخە گەنمڕەنگییە زەبەلاحەکانەوە دەدیت، بووبووە خووی کە هەموو شەوێک بچێتەوە ئەو ڕۆخە دلگیرەی ئەفریقا و لەوێ بژی. گرمە و هاشوهووشی شەپۆلەکانی دەبیست و بەلەمی ڕەشپێستەکانی دەبینی کە تیژڕەو بەسەر شەپۆلەکاندا دەیانئاژوو. بۆن و بەرامەی قەتران و گوریسە گوشە کۆنەکان کە مرۆڤ بەسەر بەلەمەکانەوە لووتی لێیان پڕ دەکات، خەونەکەیان گولاوپڕژێن دەکرد. بەیانیانیش سروەی دەشتودەر بۆنی خۆشی ئەفریقای بۆ دەهێنا.

خووی پێوەگرتبوو کە هەر کات ئەو بۆنەی هەڵبمژیبا، گورج لە خەو ڕادەپەڕی و جلەکانی دەپۆشیی و ملی ڕێی دەگرت تا کوڕەکە بێدار بکاتەوە، وەلێ بۆن و بەرامەی سروەی دەشتودەر ئەمشەو کەمەکێ زووتر گەیشت، خۆیشی دەیزانی جارێ زووە بۆ بێداربوونەوە، هەر بۆیە بەردەوام بوو لە بینینی خەونی خۆشنوود و قوولی خۆی، تا ئەو گردۆلکە سپیانەی دوورگەکان ببینێت کە لە پانتایی زەریادا سەرەتاتکێیان

دەکـرد، دواتـریش لەنـگەرگە و ڕۆخە جیاوازەکـانی دوورگەی کەنـاری. چیـدی خەونـی بە گێجەڵـووکە و وەیشـوومە و ئـافرەتەوە نەدەبینـی، تەنـانەت خەونـی بە ماسـییە گەورەکانیشـەوە نەدەدیـت، نە دەمەقـاڵێ و گۆبەنـدەکان، نە یـارییە مەزنەکـانیش، تەنـانەت خەونـی بە هـاوژینە ئازیزەکەشیەوە نەدەبینی. ئێستاکە بێ لە جێگە و شێرەکانی ڕۆخزەریـا هیچـی تری بەدی نەدەکرد، تەماشـای دەکردن کە هەروەک پشـیلە لە تـاریکیی شـەودا تەراتێنیـان دەکـرد، بە ئەندازەی کوڕەکە خۆشی دەویستن، گەرچـی هەرگیز خەونی بە کوڕەکەوە نەدیتبوو.

پیرەمێردەکە ڕاپەڕی و لە دەرگە والاکەوە تەماشـایەکی مـانگی کرد، جا پانتۆڵەکەی کردەوە و لە پێی کرد. پێی نـایە دەرەوەی کـوختەکە و لەوێ میزێکـی کـرد و بە هەورازەکەدا ملـی ڕێـی گـرت تـا بچـێ کـوڕەکە لە خەو هەسـتێنێت. لەتـاو سـەرمای بەرەبەیاندا سەراپا چرکوهۆڕ هەڵدەلەرزی، وەلێ دڵنیا بوو کە ئەم هەڵلەرزینە کەمەکێ جەستەی گەرم دادەهێنێت و کەمێکی تـریش دەکەوێـتە سـەوڵلێدان. دەرگەی ئەو خـانووەی کـوڕەی تێدا ئاکنجی بووبوو، ئەڵقەڕێزی نەبوو، پاڵی بە دەرگەوە نا و هێواش‌هێواش و بە پێخاوسی چووە ژووری. کوڕە لە ژووری یەکەمدا و لەسەر تەختەخەوێکی وەک خۆی چکۆلە خەوتبوو، لەبەر تـریفەی کـزی مـانگی نیوەگیانـدا دەیتـوانی بە ئاسـانی کوڕەکە بناسێتەوە. بە ئەسپایی دەستی خستە سەر قاچی و هەر بەو جـۆرە هێشـتیەوە تـا لە خەو ڕاپەڕی و ئـاوڕی لە پیرەمێردەکە دایەوە. پیرەمێرد سەری لەقاند و کوڕەش دەستی

گەیاندە پانتۆڵەکەی کە لەسەر کورسیی تەنیشت تەختەخەوەکەوە دانرابوو، ئینجا دانیشت و لە پێی کرد.

پیرەمێردەکە چووە دەرێ و کوڕەش کە هێشتاکە خەو بەری نەدابوو، دوای کەوت، جا پیرەمێردەکە دەستی کردە ملی و گوتی:

- ببوورە، لە خەویشم کردی!

کوڕەش گوتی:

- هەر گوێشی مەدەرێ، زوو هەستان بەس لە پیاوان دەوەشێتەوە.

بەرەو کوختی پیرەمێردەکە داگەڕان و بە درێژایی ڕێگەکە و لە تاریکیی نووتەکی شەودا، هەر پیاوی پێخاوس بوو بەو ناوەدا دەهات و دەچوو و، ئەستوونی بەلەمەکانیان خستبووە سەر شان.

هەر کە گەیشتنە کوختی پیرەمێردەکە، کوڕە پەتەکانی لەنێو سندووقەکەدا هەڵگرتن، لەگەڵ گۆچانە قولاپییەکە و نێزەکەدا، پیرەمێردەکەش چارۆگە لە ئەستوون پێچراوەکەی بە شانیدا دا. جا کوڕە پرسیی:

- قاوەیەکت بۆ بهێنم؟

- با سەرەتا ئەم کەلوپەلانە بەرینە بەلەمەکەوە، ئەوسا بە ئیسراحەت شتێک دەخۆین.

- لە یانەیەکدا کە دەمەوبەیانیان پێشوازی لە ڕاوچیان دەکرد، سەروو قاوەیەکیان لە قوتوی شیردا خواردەوە.

کوڕە لێی پرسی:

- شەو باش خەوتی باپیرە؟

ئەگەرچی بە خەبەر بوو، وەلێ هێشتاکە قورس بوو تا یەکجارەکی خەو لە چاوانیدا بتەرێنێت. جا پیرەمێردەکە وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ، باش خەوتم *مانۆلین*، ئەمڕۆ گەلێک بڕوام بە خۆم هەیە.

- منیش بە هەمان شێوە، دەبێ ئێستە بەشە سەردینەکەی خۆم و خۆیشت بهێنم، لەگەڵ چەشە تەڕ و تازەکانت. چونکە خاوەنکارەکەم خۆی شتەکان هەڵدەگرێ و نایەوێ کەس دەستیان لێ بدا.

پیرەمێرد وتی:

- ئیدی هەر کەسەو خدەوخووی خۆی، من تەنانەت ئەو کاتەش کە پێنج ساڵان بووی ڕێگەم دەدا کەلوپەلەکان هەڵگری.

کوڕەکەش گوتی:

- دەزانم. با بڕۆم، ئێستە دەگەڕێمەوە. قاوەیەکی دیکەش بخۆرەوەوە، پێشوەختە لێرانە هەق و حسابێکمان هەیە.

بە پێخاوسی بەسەر بەردە مەرجانییەکاندا بۆی دەرچوو، بەرەو ئەو کۆگای سەهۆڵە کەوتە ڕێ کە چەشەکانی تێدا دانابوو. پیرەمێردەکە لەسەرخۆ قاوەکەی خواردەوە، باش دەیزانی پێویستی پێی دەبێت و ئەمە تاکە شت دەبێت کە بە درێژایی ڕۆژەکە بە گەروویدا دەچێتە خوار. دەمێکە هازی

خواردنی نەماوە و هیچ خۆراکێک لەگەڵ خۆیدا ناباتە زەریا. شووشـــەیەک ئـــاوی لە پێشـــکۆی بەلەمەکە دانـــابوو و هەر ئەوەش بەس بوو تا ڕۆژەکەی پێ بەڕێ بکات.

کورەکە گەڕایەوە و سەردین و چەشەکانی پێ بوون، پارچە ڕۆژنامەیەکی لە چەشەکانەوە پێچابوو. هەردووکیان داگەڕانە ئەو تووڵەڕێیەی کە ڕێک و ڕاست بەرەو بەلەمەکە دەڕۆیشت، بەدەم داگەڕانەوە هەستیان بە زیـخەبەرد و لمـی ژێـر پێیـان دەکـرد، ئینجـا پاڵیـان بە بەلەمەکەوە نـا، تـا لەنێـو ئـاوەکەدا گیرسایەوە. کوڕە گوتی:

- بە هیوای بەختێکی باش باپیرە.

پیرەمێردەکەش وەڵامی دایەوە:

- منیش هیوای بەختێکی باشت بۆ دەخوازم.

پەتـی سـەوڵەکانی بە مـێخەکەوە گـرێ دا و نووشـتایەوە، لە تـاریکیی ئەونگوسـتەچاوی شـەودا کەوتە سـەوڵلێدان، تـاکوو بەنـدەرەکەی تێپەڕانـد. لێـرە و لەوێ و لە ڕۆخە جیاوازەکـانی دیـکەی زەریـاکەدا چەنـدین بەلەم بەرەو پانتـایی زەریـا بەڕێ کەوتبوون. گەرچی مانگ لەپشت شاخەکانەوە ئاوا بووبوو و ئەمیش دوور و نزیک هیچ شتێکی بەدی نەدەکرد، وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا گوێی لە شلپەشلپی سەوڵەکانیان بوو کە بەر ڕووی ئاوەکە دەکەوتن.

هەنـدێکیان جارجـارە ورتەورتێکیـان لێـوە دەهـات، وەلـێ زۆربەیـان متەقیـان نەدەکرد و دەنگی سەوڵەکانی لێ دەرچێ هیچ دەنگێکی دیکە نەدەبیسترا. زۆربەی زۆری ئەم بەلەمانەش

هەر کە لە بەندەرەکە ڕەد دەبوون، بە هیوا و نیازی دەستکەوتێکی باش و چەورەوە بلاوەیان لێ دەکرد و هەر یەکەو بە لایەکدا بەرەو پانتایی زەریا دەکەوتە ڕێ.

ئەوەندەی نەخایاند پیرەمێردەکە زانیی کە زۆر دوور کەوتووەتەوە و بۆن و بەرامەی زەوییەکانی جێ هێشتووە. بێوچان سەوڵی لێدەدا و بەمەش پتر لە بۆنی بێگەردی دەمەوبەیانیی زەریا نزیک دەکەوتەوە. لەو جێیەدا کە سەوڵی لێدەدا چاوی بەو گژوگیا زەرياييانە کەوت کە بە چەشنی فۆسفۆر ئاورینگیان دەدا. ماسیگرەکان ناوی ئەم شوێنەیان نابوو بیرە مەزنەکە، چونکە قووڵییەکەی دەگەیشتە حەوتسەد *بالا*[1]، سەدەها جۆری ماسی لە بنی ئەم تەمباڤەدا کۆ دەبوونەوە، ئەم تەمباڤانەش بەرئەنجامی ئەو تەوژمە ئاوانە بوون کە دەیانکێشا بە بنی دیوارە تووشەکانی زەریادا. لێرانەدا *ڕۆبیان* و *سەردین* کۆ دەبوونەوە، هەندێ جاریش لە قووڵترین کونوکەلەبەرەکاندا ماسیی جۆری سکوید دەر دەکەوتن. پێکرای ئەمانەش بە شەودا نزیک ڕووی ئاوەکە دەبوونەوە و بەم جۆرەش دەبوونە قوت و خۆراکی ماسییە چلێس و گەڕۆکەکان.

لە تاریکیی ئەنگوستەچاودا پیرەمێردەکە سۆسەی نزیکبوونەوەی گزنگی کرد. بەدەم سەوڵلێدانەوە گوێی لە فرکەی دەرپەڕینی *باڵندەماسییەکان* و فڕەی باڵە تۆکمەکانیان بوو، کە بەنێو تاریکیدا دەفڕین. زۆر کەیفی بەم ماسیانە

---

[1] Fathoms: بالا، پێوانەیەکی زەرياییە، کە دەکاتە شەش پێ، یان مەترێک و هەشتاوسێ سم.

دەهات، چونکە تاکە هاودەم و دۆستی ئەو بوون لە زەریادا. لە هەمان کاتدا بەزەیی بە چۆلەکەکانیشدا دەهاتەوە و دڵی پێیان دەسووتا، بە تایبەت چۆلەکە بچووکە جیقن و ڕەقەڵەکانی زەریا، کە هەمیشە مایەپووچ و بێئۆقرانە عەودالی گەڕان و دەستخستنی نێچیرێکن، بێ ئەوەی هیچیان چنگ بکەوێت. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ژیانی ئەم باڵندانە زۆر لە هی ئێمە دژوارترە، هەڵبەت جگە لە باشووک و هەڵۆ و باڵندە دز و بەلاشخۆر و دڕەکانی تر. خۆزگە بە خۆزگای خوا دەمزانی ئەم چۆلەکانە بۆ بە جۆرێ ناسک و کەمدەسەڵات ئافرێندراون کە زەریا حەپەلووشیان بکا، لە کاتێکدا ئۆقیانووس بەو ڕادەیە دڕندە و بێبەزەییە؟ گومانی تێدا نییە ئۆقیانووسیش جوان و نەرمونیانە، وەلێ دەکرێ لە چاوتروکانێدا بگۆڕێ بۆ دڕندەیەک، دڕندەیەک تا ئەوپەڕی سنوور. جا ئەم باڵندە بەسەزمانانەش کە بەدەم جووکەجووکەوە پەیتاپەیتا دەفڕن و خۆیان لە ڕووی ئاوەکە دەخشێنن تا شتێک ڕاو بکەن، زۆر لەوە ناسکترن کە لە زەریادا هەڵبکەن و بەرگەی بگرن.»

ئەو زەریای بە *لا مار* بانگ دەکرد، کە ناوێکە خەڵکی بە ئیسپانیی زەریای پێ گاز دەکەن ئەو دەمەی ئاشقی دەبن، جارجارەش هەر ئەوانەی کە ئاشقین، وەک ئەوەی ئافرەتێک بێت، جنێو و تەشەری لێ دەدەن. ژمارەیەک لە ماسیگرە لاوەکان، ئەوانەی کەڵەکیان بەکار دەهێنا و خاوەن بەلەمی بوخاری بوون و، بەلەمەکانیشیان سەردەمانێک کڕیبوون کە سی و جگەری قرشەکان پارەیەکی ئێجگار زۆری دەکرد لە بازاڕدا، زەریایان بە *ئێل مار* بانگ دەکرد، کە ناوێکی نێرینەیە و هەردەم وەک ناحەز و دژمنێک یاخود جێگەیەکی شووم لە

بارەیەوە دەدوان، وەلێ پیرەمێردەکە وەک گیانێکی مێینە لێی دەڕوانـــی، وەک گیانێـــک کە هەم دەبەخشـــێت و هەمـــیش دەستێنێت، گەر جاروبارێش ڕێگەیەکی ناقۆلا و توند دەگرێتە بەر، لەبەر ئەوەیە کە چـاری ناچـارە و هـیچ ڕێگەیەکـی دیـکە شک نابا. لە بەرخۆیەوە گوتی: «هەروەک چۆن ئافرەت سـەر دەنێتە سـەری پیاو و مێشکی دەبا، بە هەمان شێوەش مانگ زەریا لە تینوتاو و هۆش دەخات.»

بەردەوام و بێوچـان سـەوڵی لێدەدا، ئەمەش بـۆ ئەو کـارێکی گـران نەبـوو، چـونکە بەلەمەکەی لە یەک ئاسـتی خێرایـیـدا هێشـتبووەوە و، جاروبـار نەبـووایە کە تەوژمە تەمباڵەکـان ئاوەکەیان شێلوو دەکرد، ئەوا بە گشتی ڕووی ئاوەکە ساف و بێگرێ بوو. ئیدی تەوژمە ئاوەکانیش سێیەکی کارەکەیان بۆ ڕایی دەکرد و بەرەو پێشەوە پاڵیان بە بەلەمەکەوە دەنا. لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم پرشنگی گزنگدا پیرەمێردەکە زانیی کە زۆر دوورتـر لەو جێیە ڕۆیشـتووە کە مەبەسـتی بـووە لەم کـاتەدا بیگـاتێ. لە دڵـی خۆیـدا گـوتی: «یەک هەفـتەی ڕەبەق قـولاپم هاویشـتە بیرە *قوڵەکان* و هـیچم بە هـیچ نەکرد، قەیدی چییە ئەمڕۆ قولاپەکان دەهـاوێمە مۆڵگەکانی *بۆنیتۆ* و *ئەلباکور*، کێ ناڵێ بەخت یاوەرم دەبێ و دانەیەکی گەورە ڕاو دەکەم.»

بەر لەوەی تیشـکی خـۆر تەواو دونیـا ڕوونـاک بکـاتەوە، پیرەمێرد چەشەکانی دەرهێنان، لەگەڵ تەوژمەکاندا بەلەمەکەی دەهـات و دەچـوو، یەکەم چەشـە بە قـووڵایی چـل بـاڵا چـووە خـوارێ، دووەمیشـیان بە قـووڵایی حەفتـاوپێنج بـاڵا، ئەمە لە کاتێکدا سێیەم و چوارەم چەشە بەرەودوا لە قووڵایی سەد و سەدوبیستوپێنج باڵا لە ئاوی شینی زەریادا چوونە خوارێ.

چەشـەکان سـەربەرەوخوار و تونـدوتۆلانە بە قولاپەکـانەوە کرابـوون، هەرچـی کەوان و نـووکی قـولاپەکەش بـوو، بە سەردینی تەڕوتازە داپۆشرابوو. گشت سەردینەکان لە چاوەوە پێوە کرابوون، تاکوو بە تەواوی کەوانی قولاپەکە دانەپۆشن و نیوەی داگیر بکەن. بە کورتی سەراپای قولاپەکە وەک هێشووە ترێیەک چەشە کرابوو، بە جۆرێک کە مەحاڵ بوو ماسییەکی گەورە ڕێی بکەوێتە ئەو ناوە و بە تام و بۆنوبەرامەی خۆشی ئەم ماسیانە تێ نەکەوێت و پەلاماریان نەدات.

کوڕەکە دوو ماسیی *تونەی* بچووکی تەڕوبڕی بۆ هێنابوو، پیرەمێردەکەش کردبوونی بەو دوو قولاپەوە کە لە هەموویان زیاتر بە بنی زەریادا ڕۆچووبوون. هەرچی قولاپەکانی تریش بـوون، شـینە ماسـییەکی گەورەی جـۆری *شـینەڕاکەر* و زەردەماسییەکی جۆری *کراکی* پێوە کردبوون، کە لەوەوپێش بەکار هێنرابوون، وەلێ هەر بەشی ئەوەیان بە بەرەوە مابوو کە دووبـارە بکـرێنەوە بە چەشـە، چـونکە دواجـار ئەوانـیش بۆنـوبەرامەی خۆشـی سـەردینەکانیان دەگـرت. هەر یەک لە پەتەکـان باتەقـای پێنووسـێک ئەسـتوور بـوون، لە سەریشـەوە یەکـی تووڵێکیـان پێـوە کرابـوو، تـا لە ئەگەری هەر جـووڵە و پەلامارێکدا دەمودەست بخزێن و بکەونە نێو ئاوەکە. سەرەڕای ئەمـانەش پیرەمێـردەکە چـوار گلـۆلە پەتـی زیـادەی پێبـوو، کە درێژی هەر یەکەیان چل باڵا دەبوو، تا گەر ماسییەک پێوە بوو و پەتێکـی سـێ سـەد بـالایی خواسـت، ئەوا فریـای بخـات و دەستەپاچە نەبێت.

پیرەمێرد لە لایەکی بەلەمەکەوە چاوی بڕیبووە سێ تووڵەکە و بە ئەسپایی سەوڵی لێدەدا، تا پەتەکان ڕێک و ڕاست، قیت و

هاوسەنگ لە هەمان ئاستی قووڵییدا بمێننەوە. تاریکی بە تەواوی ڕەویبووەوە و خۆریش لە ئان و ساتێکدا هەڵدەهات. هێندەی نەبرد خۆر لە پانتایی زەریاوە، کز و بێتین سەری دەرهێنا. هەنووکە پیرەمێرد بە جوانی بەلەمەکانی تری بەدی دەکرد، کە نزم بەسەر ڕووی ئاوەکەوە و لەژێر کاریگەریی تەوژمەکاندا، لە نزیک کەنارەکە پەرش و بڵاو بووبوونەوە. جا بەرەبەرە خۆر درەوشاوە و بەتینتر هەڵهات و ڕووی ئاوەکە شەوقی پرشنگەکانیی پەخش دەکرد. کاتێکیش خۆر زیاتر بەرەو ئاسمان هەڵکشا، ڕووی سافی زەریا تیشکە بەتینەکانی بەرەو چاوانی پیرەمێردەکە پێچەوانە کردەوە و وەختبوو بیانسووتێنێت. پیرەمێردیش بێ ئەوەی چاوێک لە خۆری هەڵکشاوی بەتین بکات، سەوڵی لێدەدا و سەری بەسەر ئاوەکەدا شۆڕ کردبووەوە، بە وردی چاودێریی پەتەکانی دەکرد کە ڕاستەوڕاست بەنێو تاریکستانی زەریادا ڕۆچووبوون. هیچ کەس وەک پیرەمێردەکە لێزانانە و هاوسەنگ پەتەکانی نەدەهێشتنەوە، بە جۆرێک لە هەر ئاستێکی قووڵی ئاوی زەریادا، بەو جۆرەی کە خۆی دەیویست، خۆراکێکی بەلەزەت چاوەڕوانی ئەو ماسیانە بوو کە بەوێدا ڕەد دەبوون، ئەمە لە کاتێکدا ماسیگرەکانی تر هیچ باکیان بەوە نەبوو و تەوژمەکان ئەمدیو و ئەودیو گەمەیان بە پەتەکانیان دەکرد. زۆربەی کات قولاپەکانیان لە قووڵی شەست باڵادا بوون، کەچی خۆیان وایان دەزانی لە قووڵایی سەد باڵادان. پیرەمێردەکە لە دڵی خۆیدا گوتی: «خۆ من ڕێک و ڕاست لە شوێن خۆیاندا دەیانهێڵمەوە، تەنها ئەوەیە کابرایەکی بەدبەختم و چیدی بەخت یاوەرم نابێت. کێ چووزانێ؟ ڕەنگە

ئەمڕۆ هەر شتێک ڕاو بکەم. هەموو ڕۆژێ لاپەڕەیەکی تازەیە لە ژیانی مرۆڤدا. خۆ گەر مرۆڤ بەبەخت بێت باشترە، وەلێ من هەمیشە وای بە باش دەزانم جددی و وردەکار بم، تا گەر ڕۆژێ لە ڕۆژان بەخت یاوەرم بوو، ئەوا بە تەواوی تەیار و ئامادە بم.»

دوو کاتژمێر تێپەڕی و خۆر پتر هەڵکشا. ئێستە گەر سەرنجی ڕۆژهەلاتیشی بدایە چاوەکانی ئازاریان پێ نەدەگەیشت. تەنها سێ بەلەم لەو ناوە دیاربوون، کە نزم‌نزم و دوور لەو بە نزیک کەنارەکەدا ڕێیان دەکرد. لە بەرخۆیەوە گوتی: «ئەوەتەی هەم خۆری بەرەبەیان ئازاری چاوەکانم دەدا، وەلێ هێشتاکە هەر ساغ و تیژبینن، دەمەوئێواران دەتوانم بە ئاسایی بێ ئەوەی چاوەکانم بسووتێنەوە، چاوی سەیری بکەم. خۆ تینیی خۆری ئێواران بەو ڕادەیەش کز نییە، وەلێ نازانم، خۆری بەیانیان ئێجگار بەتینە و هەموو جار چاوەکانم ئازار دەدا.» لەو ساتەدا چاوی بە بازێکی زەریایی باڵدرێژی ڕەش کەوت کە بەسەر سەریەوە دەخولایەوە، لەپڕ باڵەکانی بە پشتیەوە نووساندن و بە پرتاو بەرەو خوارەوە زەفەری هێنا، جا هەمدیس بەرز بووەوە و کەوتەوە خولخواردنی خۆی. پاشان پیرەمێردەکە بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- هەبێ‌ونەبێ شتێکی دۆزیوەتەوە، هەروا بە گاڵتە بەو ئاسمانەوە ناخولێتەوە.

هێواش‌هێواش کەوتە سەوڵلێدان بەرەو ئەو شوێنەی باڵندەکە بەسەریدا دەسووڕایەوە و لە خەمی هێشتنەوەی پەتەکان لە ئاستی خۆیاندا زاتی نەدەکرد خێرا بڕوات. ئەمڕۆ کەمێک پێش

تەوژمەکــان کەوتبــوو، هەر بــۆیەش گەر شــوێنی باڵنــدەکە نەکەوتایە، ئەگەری هەبوو خێراتر ڕاو بکات. باڵندەکە هەنووکە باڵەکــانی مــت کردبــوون و بەرزتــر بە حەواوە، دەســتی بە خولخــواردن کردبــوو. لەپــڕ بە گــوژمەوە بەرەو خــوارەوە زەفەری هێنــا، پیرەمێــردەکە ماســییەباڵندەکانی بینــین کە نائومێدانە لە ئاوەکەدا هەڵبەز و دابەزیان بوو. هاواری کرد:

- دۆلفین! دۆلفینێکی گەورە.

ســەوڵەکانی لە قووڵفەکــان دەرکێشــا و پەتێکــی کــورتی لە بــن تەختەکەی ژێریدا دەرهێنا، کە وەک ئەوانی دیکە نەبوو و تەل بــوو، قــولاپێکی قەبــارە مامناوەنــدیی پێــوە بــوو. بە ســەردینێکی کــردە چەشــەی قــولاپەکە و لە لایەکــی بەلەمەکەوە فڕێــی دایە زەریاوە، جا بە ئەڵقەی پشت بەلەمەکەوە گرێی دا. دەستی دایە قولاپێکی دیکە و چەشــەی پێوە کرد و بە هەمــان شێوە بەنێو ئــاوەکەدا شــۆڕی کــردەوە. ئینجــا کەوتەوە ســەوڵێدان و چاودێریکردنی باڵندەکە، کە نزم بەسەر ڕووی ئاوەکەوە هەوڵ و تەقەلـلای چنگخســتنی نێچیرێکــی بــوو. پیرەمێردەکە دەیبینــی کە چلۆن بەدەم شوێنکەوتنی ماسییەکانەوە، زوو زوو بە پڕتاو شــالاوی بــۆ دەبــردن و بێباکــانە لە شــەقەی بــاڵی دەدایەوە و بەرز دەبــووەوە. دۆلفینەکــانیش ڕاوەدووی باڵندەماســییەکانیان دەنا و پیرەمێردەکەش چاوی لەو بڵقانە بوو کە بەســەر ڕووی ئــاوەکەوە دروســتیان دەکــردن. دۆلفینەکــان تیــژڕەو بەنێــو ئاوەکەدا شــوێن ماســییەکان دەکەوتــن و جاروبــاریش خۆیــان مەلاس دەدا، تا گەر ماسییەکان خۆیان بەنێو ئاوەکەدا کردەوە، پەلاماریان بدەن.

لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەمە ڕەوە دۆلفینێکە، ئەوەتا بە هەموو لایەکدا بڵاو بوونەتەوە و باڵندەماسییەکانیش لەم نێوەندەدا قوتاریان نابێ، وەک چۆن باڵندەکەش دەبێ مایەپووچ و دەستبەتاڵ بگەڕێتەوە، چونکە باڵندەماسییەکان زۆر لەوە گەورەتر و خێراترن کە ئەم بتوانێ زەفەریان پێ بەرێ و ڕاویان بکا.»

تەماشای باڵندەماسییەکانی دەکرد کە یەک لەدوای یەک لە ئاوەکەدا دەردەپەڕین و لەولاشەوە باڵندەکە بێهوودانە دەیکۆشی تا ماسییەک چنگ بخات. لە دڵی خۆیدا گوتی: «تازە ئەم ڕەوە دۆلفینەش فت، گەلێک تیژڕەو و دوورن، وەلێ کێ نالێ دانەیەکی وێڵ و سەرلێشێواویان لێ ڕاو ناکەم! دەکرێ ماسییە گەورەکەی خۆیشم هەر لەم ناوەدا بێ. ئای ماسییە گەورەکەم، هەر دەبێ لەم ناوەدا بێ.»

گەواڵە هەور هەروەک شاخ بەسەر زەوییەکانەوە بەرز بووبوونەوە، کەنار زەریاش بە گردۆڵکە خۆڵەمێشییەکانی پشتەوەی، تەنها هێڵێکی شینکاری درێژی بە بەرەوە مابوو. ئاوی زەریاکە شینێکی تێر بوو، هێندە تێر کە وەنەوشەیی دەچووەوە. پیرەمێردەکە بەدەم تەماشاکردنی نێو ئاوەکەوە، گیانلەبەری ڕووەکی و کەفەژیلکە سوورەکانی ناو ئۆقیانووسی بینین، ئەو ڕووناکییە ئەفسووناوی و سەیرەشی کە خۆر ئاراستەی دەکرد. سەرنجی بە وردی خستبووە سەر ئەو تیشکانەی کە ڕاستەوڕاست بەرەو بنی زەریاکە ڕێی خۆیان دەگرتە بەر، تا بە تەواوی لە تاریکستانی زەریادا لە چاو ون دەبوون. هەرکات چاوی بەم کەفە ژیلکانە دەکەوت شاد و کەیفخۆش دەبوو، چونکە لە هەر شوێنێک ئەم گیاندارە

سەرئاوکەوتووانە بوونیان هەبووایە، ژمارەیەکی ئێجگار زۆر ماسیش لەوێ کۆ دەبوونەوە. ئێستاکە خۆر بە تەواوی هەلکشابوو، تیشکە پەرتبووەکانی سەر ڕووی ئاوەکە و گەواڵە هەوری سەر زەوییەکانیش، مژدەی کەشێکی لەبار و سازیان دەدا.

باڵندەکە ڕۆیشتبوو و هێندەی نەمابوو بە تەواوی لە چاو ون بێت. پێدەچوو بێجگە لە زەردە گیای ڕەنگبزرکاوی *سیرگاس* و فوکەرەی ئەرخەوانیی لیقی پەلکەزێڕینەیی سییە زەریا هیچ شتێک بەسەر ڕووی ئاوەکەوە دیار نەبێت. لەتەک بەلەمەکەوە سەرئاو دەکەوت، زووزوو خۆی وەردەچەرخاند و خێرا ڕاست دەبووەوە و بە سروشتی شاد و کەیفخۆشانەی خۆی وەک بلقی سابوونێک سەرئاو دەکەوتەوە و، کلکە بڕندە ئەرخەوانییەکەی کە درێژییەکەی دەگەیشتە مەترێک، بە شوێن خۆیدا کێش دەکرد. پاش کەمێک پیرەمێردەکە گوتی:

- ئەگوا مالا، ون بە لە بەرچاوم هەی سۆزانی!

بێ ئەوەی دەست لە سەوڵەکان بەر بدات کەمێک بە پێشدا نووشتایەوە و زەقزەق چاوی بڕییە ئاوەکە، ئەو ماسییە وردیلانانەی بینیین کە ڕەنگی سییەزەریایان گرتبوو، لەنێو ئەواندا و لە سایەی سێبەری بلقەکاندا مەلەیان دەکرد. ئەم وردەماسییانە بە چەشنێک خولقاون کە ژەهری سییەزەرییاییەکان کاریان تێ ناکات، وەلێ مرۆڤ ئەم تایبەتمەندی و توانایەی نییە. جارێکیان و ئەو کاتەی پیرەمێردەکە سەرقاڵی ڕاوکردنی پانکەماسییەک بوو، هەندێ لەم کلکە ئەرخەوانییە لیقانە خۆیان بە پەتەکەوە ئاڵاندبوو،

پیرەمێــردەکە بێئاگــا لێیــان دەســتی لــێ دان و دەمودەســت سەراپای قۆڵی بووە لیر و کەوتە ئاڵۆش، دەتگوت دەستی لە لەولاو و داربەڕوویەکی ژەهـراوییەوە داوە، وەلـێ ئەو ئێش و ئازارەی ئەگوامالا دەیگەیێنێت کتوپڕ و لەناکاوە، ئاگات لە دونیا نیـیە و هەر ئەوەنـدە دەزانـی وەک قـامچییەک چـزەت لـێ هەڵدەســتێنێت. تــا بڵێیــت لەبەردڵان و نــازدار بــوون، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەر گیاندارێکی تری زەریا بەپێچ و تەڵەکەبازتر بوون. کاتێ پیرەمێردەکە دەیبینی کیسـەڵە گەورەکان یەکیەک قوتیــان دەدەن و دەیانماشـــنەوە خەنیـــی دەبـــوو. هەر کە کیسـەڵەکان دەیاندۆزنەوە، دەچـنە بەردەمیـان و تونـد چاویـان دەنـــووقێنن تـــا خۆیـــان لە ژەهرەکەیـــان بەدوور بگـــرن، جـــا یەکراســـت پەلاماریـــان دەدەن و بە لەش و کلـــک و هەمـــوو شتێکەوە حەپەلووشیان دەکەن. پیرەمێردەکە گەلێک کەیفی بەم دیمەنە دەهات و سـەرباری ئەمەش حەزی دەکرد هەر کات با لە ڕۆخـی زەریـادا سرەوت، خـۆی هەڵـداتە سـەریان و بەدەم پلیشاندنەوەیانەوە بە پاژنەی پێ، گوێ لە جلق و فلقیان بگرێت.

بێئەنـدازە شـەیدای کیسـەڵە سـەوزەکان بـوو، هەروەهـا ئەو کیسـەڵانەش کە قەپۆزیـان لە دەنـووکی داڵ دەچـوو، چـونکە لەگەڵ ئەوەدا کە پـارەیەکی بـاش دەکەن، خێراشـن! لە هەمـان کاتیشدا هەستی بە جۆرە بەزەییەکی خەمخۆرانە و دۆستانە دەکـرد دەرهەق بەو کیسـەڵە گەلـۆر و زلە -بە شـێوە نـاقۆلا- قەپێلـک زەردانە، کە ڕێگـای سـەیر سـەیریان لە حەزلێکردنـی یەکتـــردا دەگـــرتە بەر و هەر بە چـــاو نووقـــاوییەوە سییەزەریاییەکانیان قوت دەدان. گەرچی چەند ساڵێک بەسەر بەلەمێکەوە خەریکی ڕاوکردنی ئەم کیسەڵانە بوو، وەلێ دڵڕەق

و بێبەزەیی نەبوو بەرانبەریان. بەزەیی بە گشتیاندا دەهاتەوە، تەنانەت ئەو کیسەڵە گەورانەش کە پشتیان لە سندووق دەچوو و کێشـیان تەنێـک دەبـوو و، لە درێژیشـدا بەقەد بەلەمێـک دەبوون. بە گشتی خەڵکی ئەوەی بڵێیت بەزەیی بەرانبەر بەم کیسەڵانە لە دڵیاندا نەبوو، هۆکارەکەشی دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە دڵی ئەم کیسەڵە بێچارانە پاش کوشتن و هەڵدڕینیشیان بۆ چەند کاتژمێرێک هەر لە ترپەترپ ناکەوێت.

لە زەینـی خۆیـدا گـوتی: «دڵـی منـیش کتومـت وەک هـی ئەم کیسەڵانەیە و، دەست و پێیەکانیشم هەر لە هی ئەوان دەچن.» وێڕای ئەمەش بە درێژایی مـانگی ئـاب هەر خەریکی خواردنی هێلکە سپییەکانیان بوو، تا کە مـانگی ئەیلول و تشـرینی دووەم داهـاتن، بە گـوروتین و ورەیەکـی پـۆلایینەوە بچێتە مەیـدانی ململانێی ماسییە گەورەکەیەوە. هەر ئەوەندە و بەس نا، بەڵکوو خـووی پێـوە گرتبـوو کە هەمـوو ڕۆژێـک، لەو کـوختەی ماسـیگرەکان کەلوپەلەکانیـان تێدا دادەنـا، لە جـامێکی گەورەی ستیلدا کەمێک ڕۆنی جگەری قرش بخواتەوە. تـا بڵێی تـامێکی ناخۆشـی هەبـوو و زۆربەی زۆری ماسـیگرەکان ڕقیـان لێـی بـوو، وەلـێ هەرچۆنێـک بێـت لە هەڵسـانی زووی بەیانیـان ناخۆشـتر نەبـوو، بـێ لەمەش چارەسـەر و دەرمـانێکی یەکاویەکی هەڵامەت و کۆکە و درمە و گەلێک سوودی بۆ چاو و بەهێزکردنـی بینـایی هەیە. سـەرنجی پیرەمێـردەکە بەرز بـووەوە و دووبـارە باڵنـدەکەی بینیـیەوە کە بە ئاسـمانەوە خوولی دەدا. جا بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- دونیـا قسـە بکـا ماسـییەکی دۆزیـوەتەوە! بـۆیە وا دەسووڕێتەوە.

هیچ باڵندەماسییەک لە ئاوەکەدا دەرنەپەڕی، هیچ جۆرە ماسییەکی دیکەش بەو ناوەدا دیار نەبوو، وەلێ لەو ساتەدا کە پیرەمێردەکە ورد سەرنجی دەدا، ماسییەکی تونەی بچووکی بەرچاو کەوت کە لە ئاوەکەدا دەرپەڕی، لە هەوادا ئەمدویونەودیویکی کرد و خێرا سەرەتا سەری، ئنجا لەشی بەنێو ئاوەکەدا کردەوە. جەستەی لە بەر تیشکی خۆردا وەک کانزایەک دەبریسکایەوە و ورشەی دەهات.

پاش تاوێک و دوای ئەوەی بەرەو قووڵایی زەریا گەڕایەوە، ماسیی دووەم و سێیەم هەڵبەزین، تا وای لێهات لە هەموو گۆشە و لایەکی ئاوەکەوە هەڵدەبەزین و بە جارێک ڕووی ئاوەکەیان شڵەقاند. پێکڕا بە ڕاست و چەپدا بێئۆقرانە خۆیان بۆ چەشەکان هەڵدەبڕی و ئابلۆقەیان دابوون. پیرەمێرد لە بەرخۆیەوە گوتی: «گەر تیژ بۆی دەرنەچن، ئەوا حەتمەن پێیان ڕادەگەم و دەیانگرم.» پاشان سەرنجی چووە سەر ئەو پۆلە ماسییەی ڕووی ئاوەکەیان کەفچڕین و چەور کردبوو، باڵندەکەش پەیتاپەیتا شاڵاوی بۆ ماسییە وردیلە تۆقیوەکان دەبرد و هەوڵی گرتنی دانەیەکیانی دەدا. ئینجا گوتی:

- بە ڕاستی ئەم باڵندەیە هاوکارێکی چاکە.

پەتی قولاپی پشتەوەی بەلەمەکە لەو ساتەدا کە لەژێر پێیدا بوو، توند بوو. دەمودەست سەوڵەکانی دانان و دەستی دایە پەتەکە و توند گرتی، هەستی بە لەرزین و خۆڕاتەکاندنی ماسییە تونەی چکۆلە دەکرد، جا دەستی لێ توند کردەوە و کەوتە ڕاکێشانی. تا زیاتر ڕای دەکێشا، فرتە و ڕاتەکاندی ماسییەکە زیاتر دەبوو، لەو ساتەدا و بەر لەوەی بە تەواوی

ڕاکێشی ناو بەلەمەکەی بکات، لەنێو ئاوەکەدا چاوی بە پشتە شینکار و لا ئالتوونییەکانی کەوت. لە بەر تیشکی درەوشاوەی هەتـــاودا ماســـییەکە پەڕیـــیە نێـــو بەلەمەکە، چـــاوە گەورە دەرپۆقیوەکـــانی دادڕیبـــوون و بەدەم گیانـــدانەوە کەوتە هەڵبڵـــۆقین[1] و فرتەفـــرت و بێشـــۆقرانە کلکـــی بە بەلەمەکەدا دەکێشـــا. پیرەمێـــرد کە بینیـــی بەو جـــۆرە دەناڵێنێـــت و لە گیانەڵلادایە، بەزەیی پێدا هـاتەوە و بۆ ئەوەی نەجاتی بدات، دانەیەکی بە تەپڵی سـەریدا سرەواند و بە شـەقێک -کە تا ئەو دەمەش هەر هەڵدەلەرزی- بەرەو سێبەری پشتەوەی بەلەمەکە خلۆری کردەوە. دواتر پیرەمێردەکە هاواری کرد:

- ماسیی *ئەلباکورە*[2]، چەشەیەکی باشی لێ دەردەچێ، کێشی لە دە ڕەتڵ کەمتر نییە.

نەیـدەزانی لە کەیەوە بە دەنگـی بەرز کەوتـووەتە خۆدوانـدن! ســـەردەمانێک کە بەســـەر بەلەمـێکەوە بـوو، لە بەرخـۆیەوە گـۆرانیی دەگـوت، هەنـدێک جـاریش بە شـەودا و کاتێـک هەر خـۆی بە تەنیـا لە بەلەمـی ڕاوەماسـی، یـان ڕاوە کیسـەڵەکاندا دەمـایەوە و سـوکانی دەگێـڕا دەکەوتە گـۆرانی وتـن. هەبـێ و نەبێ لەو کـاتەوەی تەنیـایە و کـوڕیژگەکەی لا نییە بە دەنگـی بەرز قسـان دەکات، وەلێ بە بیری نەدەهـاتەوە. ئەو دەمـانەی لەگەڵ کـوڕیژگەکە ڕاویـان دەکـرد، کەم تـا زۆر ئەگەر زۆر گرنگ نەبووایە و پێویستی نەکردبا، متەقیان لێوە نەدەهات. بە زۆری هەر بە شـــەودا قســـەیان دەکـــرد، یـــان ئەو کاتـــانەی

---

[1] هەڵبڵۆقین: جووڵانەوەی گیاندار لەسەر زەوی پاش کوشتنی، وەک ماسی و مار.
[2] Albacore: یانیش ناوە زانستییەکەی «thunnus alalunga» جۆرێکە لە ماسیی تونە، کە زیاتر لە ئاوە گەرم و کەمەرەییەکاندا هەیە.

ڕەشەبای تووش کەشتیکی ناسازی دەخولقاند و کارەکەیانی پەک دەخست. لە زەریادا باشتر وایە مرۆڤ لە خۆیەوە نەداتە قسەکردن و ورتەورت. پیرەمێردەکە زۆر بڕوای بەم دابونەریتە هەبوو و ڕێزی لێ دەگرت، کەچی ئەوەتا ئێستە کار لە چار و دووچاردا نەماوە و هەرچییەک دێت بە مێشکیدا ڕاست بە دەنگی بەرز دەیڵێت، هەڵبەت ئەمە لەو کاتەوەی کە تەنیایە و بەم قسانە کەس بێزار ناکات. جا بە دەنگی بەرز گوتی:

- گەر خەڵکی بمبینن ئاوا بەرز قسە دەکەم، بێ چەندوچوون دەڵێن کابرا تێک چووە و شێتوشوورە، وەلێ من باکم بە قسە و قسەڵۆکی ئەوان نییە، چونکە شێت نیم. قابیلە چییە! دەوڵەمەندەکان لە بەلەمەکانیاندا ڕادیۆیان هەیە، قسەیان بۆ دەکا و هەواڵ و باسوخواسی یارییەکانی بەیسبۆڵیشیان بۆ دەگوازێتەوە.

لە دڵی خۆیدا وتی: «ئێستە کاتی بیرکردنەوە لە بەیسبۆڵ و بەزموڕەزم نییە، پێویستە بیرم تەنها و تەنها لای ئەو شتە بێ کە بۆی هاتوومەتە بوون.»

پاش کەمێک بیری کردەوە: «ڕەنگە لەم ڕەوە ماسییەدا دانەیەکی گەورەی تێدابێ. من جگە لە ماسییەکی وێڵی *ئەلباکورە* کە دوای قووتی خۆی کەوتبوو هیچی ترم ڕاو نەکردووە، وەلێ خۆ تیژڕەو و دووریش بوو. سەیرە ها! ئەمڕۆ نیگام دەچێتە سەر هەرچییەک، وەک برووسکە تیژ بەرەو باکووری ڕۆژهەڵات تێی دەتەقێنێ، تۆ بڵێیت پەیوەندیی

بە کاتەوە نەبێ! یا ئەمە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی کەش و من لێی بێئاگام؟»

چیدی هێڵی باریکی کەنارەکەی نەدەبینی و بە تەواوی ون بووبوو. هەموو ئەوەی دەیبینی، لوتکەی گردۆڵکە شینکارەکان بوو، کە وەک ئەوەی بە بەفر داپۆشرابن سپی دەیاننواند، جا تۆزێ سەرووتر و بەسەر ئەوانەوە چەند گەواڵە هەورێک بە چەشنی کۆمەڵە شاخێکی بەفرین وەستابوون. ئاوی زەریا ئێجگار لێڵ و تاریک بوو، ڕووناکیش چەند پرشنگێکی بەسەر ڕووی ئاوەکەوە دروست کردبوو، هەزاران کەفەژیلکە لەژێر تیشکی بەتینی خۆردا کە گەیشتبووە بەرزترین ئاستی، توانەوە. پیرەمێردەکە بێ لە پرشنگە پەرت و بلاوەکانی ناو ئاوی شینی زەریا و قولاپەکانی کە نزیکەی یەک میل، ڕاست و ئاسۆیی چووبوونە خوارێ و جێگیر وەستابوون هیچ شتێکی تری بەدی نەدەکرد.

ماسییە تونەکان بەرەو بنی زەریا داگەڕابوون. ماسیگرەکان بە گشت جۆرە ماسییەکیان دەگوت تونە، تەنها کاتێک تیرە و جۆرەکانیان جیا دەکردنەوە کە دەیانفرۆشتن، یاخود ئەو کاتانەی دەیانگۆڕینەوە بە چەشە. تیشکی خۆر تا دەهات بەتینتر و تاقەتپڕوکێنتر دەیجۆشاند، ژێر چەناگە و گەردنی پیرەمێردەکەی داخ کردبوو و بەدەم سەوڵلێدانەوە هەستی کرد پشتی شەلالی ئارەقە بووە و باریکە داوێکی ئارەقە بە پشتیدا دادەچۆڕێت. لە دڵی خۆیدا گوتی: «باشە خۆ دەتوانم بەلەمەکە بدەمە دەست تەوژمەکان و خۆیشم سەرخەوێکی بۆ بشکێنم، جا پەتەکەش بە پەنجە گەورەی قاچمدا پێچ دەدەم، تا کتوپڕ هەر شتێک ڕووی دا یەکسەری بەئاگا بێنم، وەلێ ئەمە

هەشتاوپێنجەمین ڕۆژمە و پێویستە بە وریایی و بێدارییەوە کار بکەم.» چاوی بڕیبووە پەتەکان و لەپڕ هەر ئەوندەی زانی یەکێک لە توولە سەوزەکان بزوت و پەڕییە ئاوەکەوە. جا گوتی:

- بەڵێ، بەڵێ!

دەستوبردێکی کرد و بە پارێزەوە، بێ ئەوەی بهێڵێ بەر ڕووی بەلەمەکە بکەون، سەوڵەکانی دەرکێشان، جا چەمییەوە و بە ئەسپایی پەتەکەی خستە بەینی کەلەموست و ئەنگوستی دۆشاومژەی دەستی ڕاستییەوە. سەرەتا پەتەکەی بە هێواشی گرتبوو و هەستی بە هیچ گرژی و قورساییەک نەکرد، جاری دووەمیش هیچ، وەلێ هێندەی نەخایاند هەستی بە ڕاکێشانێک کرد، ڕاکێشانێکی تا ڕادەیەک سووک، نە بە پڕتاو، نە قایم، باش دەیزانی چ شتێک لەپشت ئەم ڕاکێشانەوەیە. لە قووڵیی سەد پێدا، *مارلین*ێک مژووڵی خواردنی ئەو سەردینانەیە کە بە نووک و کەوانی قولاپەکەوە کراون، لە کاتێکدا نووکی قولاپە دەستییەکە سەری ماسییە تونە چکۆلەکەی کون کردبوو. پەتەکەی بەکاوەخۆ گرت، بە دەستی چەپیشی هێواشهێواش گرێی توولەکەی کردەوە، بەم جۆرە دەیتوانی وردەوردە پەتەکە لەنێوان پەنجەکانید شل بکات، بێ ئەوەی ماسییەکە هەست بە هیچ ڕاکێشان و لەرزینێک بکات.

بیری کردەوە: «مادام لەم مانگەدا ڕاو دەکەم و زۆریش لە کەنار دوور کەوتووومەوە گومانی تێدا نییە ماسییەکی گەورەیە.» پاشان بە ماسییەکەی گوت: « بخۆ ماسییەکە، بخۆ! تکات لێ دەکەم بیانخۆ! لەبەر چاوە جوانەکانی تۆیە، وا بە تەڕ

و تازەیی هێشوومنەتەوە! هەر بە تایبەت لە قووڵایی شەش سەد پێی ئەو ئاوە تاریکەدا بۆ تۆم ئامادە کردوون. دەی، سوورێکی تر بدە و بگەڕێوە بیانخۆ!» هەستی بە توندبوونەوەیەکی هێواش کرد لە پەتەکەدا، جا ڕاتەکاندنێکی توند، وا دیاربوو پچڕاندنی سەری سەردینێک بە قولاپەکەوە کارێکی هێندە سانا نەبێت، وەلێ سەرلەبەری ئەمانە جارێکە هیچیان دەرنەدەخست.

پیرەمێردەکە هاواری کرد: «دەی وەرە، سوورێکی دیکە بدە، بەس بۆنیان کە! تووشەرمەف بەلەزەت نین؟ بە دڵی خۆت لێیان بخۆ، هەر کە لەوانەش بوویتەوە، ماسییەکی تونەی گۆشتن و سارد و بەلەزەت چاوەڕوانتە. شەرم مەکە ماسییەکە! بیانخۆ!»

چاوەڕوانی بوو و پەتەکە لە بەینی کەڵەموست و پەنجەگەورەیدا بوو، بە وردی لە یەک کاتدا چاودێریی گشت پەتەکانی دەکرد، چونکە دەکرا ماسییەکە سەر و خوار بکات. هەمدیس هەستی بە هەمان سووکەلەرزین کردەوە، پاشان هاواری کرد: «ئەوەندەی نەماوە بیانخوا، خوایە گیان یارمەتیی بدە بیانخوا!» وەلێ ماسییەکە نەیخواردن. ماسییەکە ڕۆیشت و پیرەمێردەکەش هەستی بە هیچ نەکرد. جا گوتی:

- نا، ناکرێ ڕۆیشتبێ، بۆ خاتری مەسیح! ئاخر چۆن دەکرێ بڕوا. بە دڵنیاییەوە خەریکە سوورێکی دیکە دەدا، داماوە ڕەنگە پێشتر بە قولاپێکەوە بووبێ و ئازارەکەی بیر نەچووبێتەوە.

سووکەتوندییەک گەڕایەوە پەتەکە و ڕووخساری پیرەمێردەکە گەشایەوە. جا گوتی:

- خۆ گوتم! سوورێکی دا و گەڕایەوە، ئێستە بە ئیسراحەت دەیانخوا.

ئەو دەمەی هەستی بە لەرزینی پەتەکە دەکرد، لە خۆشیاندا پێی عەردی نەدەگرت. دواتر هەستی بە ڕاکێشان و توندبوونێکی ئێجگار بەهێز کرد، باش دەیزانی هی قورسیی ماسییەکەیە. یەکەم گلۆلە پەتی زیادەی هێنا و پەتەکەی نێو دەستی شل کرد، جا زیاتر و زیاتر شلی کرد تا خۆبەخۆ بخزێ و ماسییەکە نەسڵەمێتەوە. وێڕای شلکردن و خزینی پەتەکە بەنێو پەنجەکانیدا، کەچی هێشتاکە هەستی بە قورسیی ماسییەکە دەکرد و، فشاری پەنجەکانی پیرەمێردەکەش لەسەر پەتەکە هەستپێکراو بوو. ئینجا گوتی:

- ئەمە چ ماسییەکە! قولاپەکە لە دەمی چەقیوە، کەچی هەر مل دەنێ.

بیری کردەوە: «پاش ئەمە دەگەڕێتەوە و بە تەواوی قوتی دەدا.» وەلێ ئەمەی نەگوت، چونکە دەیزانی گەر مرۆڤ پێش سەرکەوتن ئاهەنگ و پێشبینیی دلخۆشکەرانە بکات، ئەوا ڕەنگە هەرگیز ڕووی ڕاستەقینەی سەرکەوتن نەبینێت. دەیزانی ئەمە چ ماسییەکی گەورەیە، دەیهێنایە پێشچاوی خۆی کە چۆن لەو تاریکستانەدا مەلە دەکات و ماسییە تونەکەش گیراوەتە قوڕگی. لەو ساتەدا هەستی کرد ماسییەکە لە جووڵە کەوتووە، وەلێ پەتەکە هێشتا لەنێو دەستیدا قورس بوو و قورساییەکە تا دەهات زیاتر دەبوو، ئەمیش نەختێک پەتی دیکەی بۆ شل کرد. بۆ ساتێک پەتەکەی لە پەنجەکانیدا مت کرد، وەلێ قورساییەکە هێندەی تر زیادی کرد و پەتەکە بە شێوەیەکی

ستوونی ڕاستەوڕاست بەرەو خوارەوە دەچوو. پیرەمێردەکە گوتی:

- تەواو قەپاڵی پێدا کردووە، با ئێستە وازی لێ بهێنم بیخوا و بە باشی قوتی بدا.

پەتەکەی لەنێو پەنجەکانیدا بەردا، دەستی چەپی درێژ کرد و سەرپێیانە و خێرا هەردوو سەری گلۆلە پەتە زیادەکانی بەیەکەوە گرێدان، ئێستە بە تەواوی تەیار و ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوە بوو. هەنووکە سێ گلۆلە پەتی زیادەی لە بەردەستدایە کە درێژیی هەر یەکەیان چل باڵا بوو، ئەمە جگە لەو پەتەی کە بەدەستیەوە بوو. جا ڕووی قسەی کردە ماسییەکە و گوتی:

- دەی کەمێکی دیکەشی لێ بخۆ، باش باش بیخۆ و هیچی لێ نەهێڵیتەوە!

لە دڵی خۆیدا گوتی: «بیخۆ بیخۆ، تا قولاپەکە بچەقێتە دڵت و بتکوژێ، ئەوساکە هێواش هێواش وەرەوە سەر تا گوچانە قولاپییەکەت لێ بخەمە کار. زۆر چاکە، ئامادەی؟ هێشتا تێرت نەخواردووە؟»

بە دەنگێکی بەرز گوتی: «ئێستا!». جا بە هەردوو دەست توند پەتەکەی ڕاکێشا، لەم ڕاکێشانەشدا کەم تا زۆر مەترێک پەتی گەڕاندەوە، ئینجا بە هەموو هێزی خۆیەوە ڕایکێشا و ڕایکێشا، بەردەوام و بە هەردوو دەستی پەتەکەی ڕادەکێشا و بۆ ئەم مەبەستەش پەنای بردبووە بەر قورسایی لەشی و قاچەکانیی توند لە بەلەمەکە گیر کردبوون.

ئەم هەوڵ و تەقەللایەشی هیچی بە هیچ نەکرد. بەکاوەخۆ ماسییەکە دوور کەوتەوە، پیرەمێردەکەش نەیتوانی بستێک چیبە بەرزی بکاتەوە. پەتەکەی تەواو تۆکمە و جیڕ بوو، هەر بە تایبەت بۆ ڕاوی ماسیی گەورە دروست کرابوو. جا بە پشتیدا شەتەکی دا و ڕەپ بوو، تنۆکتنۆک ئاو بە چواردەوریدا دەپرژا. پەتەکە بەنێو ئاوەکەدا بە نزمی خشەی دەهات و پیرەمێردەکەش خۆی بە جێگەی سەوڵ لێدانەکەوە نووساندبوو و دەستبەرداری نەدەبوو. خۆی بە پشتدا دەچەماندەوە تا زیاتر ڕێگریی هێزی کێشکردنەکە بکات. جا وردەوردە بەلەمەکە بەرەو باکووری ڕۆژئاوا بووەوە.

بەسەر ئاوی کشوماتی زەریاوە ماسییەکە هەروا ڕێک و ڕاست ملی دەنا و پیرەمێردەکەش بە شوێنیدا ڕێی دەکرد. چەشەکانی تر هێشتاکە لە قووڵایی ئاوەکەدا بوون، وەلێ لەم بارودخەدا دەستەپاچە بووبوو و هیچ کارێک نەدەکرا. پاشان بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- خۆزگە کوڕەکەم لەگەڵ دەبوو، ئەوەتا هەروەک مێخێکی زەریا بە شوێن خۆیدا ڕامدەکێشێ. دەکرا پەتەکە کەمێ توندتر ڕاکێشم وەلێ ترسی ئەوەم هەبوو ماسییەکە بە یەک تەکان بیپچڕێنێ، هەنووکە دەبێ تا بتوانم کۆڵ نەدەم، ڕایگرم و گەر پێویستیشی کرد ئەوا پەتەکەی بۆ شل بکەم. دەبێ شوکری خوا بکەم کە بەرەو پێشەوە دەڕوات نەک بۆ خوار و بەرەو قووڵایی.

«باشە گەر ئاراستەی مەلەکردنی بگۆڕێ بەرەو بنی زەریا، ئەوکات دەبێ چی بکەم؟ نازانم، ئەی ئەگەر هەر بەو جۆرە

مرد چی؟ ئەوەشیان نازانم. ئەوەندە دەزانم کە هەر شتێ دەکەم، یانی شتگەلێکی زۆر هەن کە بیانکەم.» پەتەکەی توند بە شانیدا جەڕ دابوو و چاودێریی لادان و بزاوتی ماسی و بەلەمەکەی دەکرد کە بەرەو باکووری خۆرهەلات ڕێی دەکرد. لە بەرخۆیەوە گوتی: «قابیلە بۆ کوێ دەڕوا! هەر دەیکوژێ، خۆ ناتوانێ هەتا دونیا دونیایە ئاوا بەردەوام بێ.» چوار کاتژمێر دواتر، ماسییەکە هەروا بەبێ وچان و بەلەسانە بەرەو پێشەوە ملی دەنا و بەلەمەکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا، پیرەمێردەکەش بە ورەیەکی بەرزەوە، پەتەکەی بە پشتیدا شەتەک دابوو. ئینجا گوتی:

- دەمەونیوەڕۆ بوو کاتێ قولاپەکەم دەرخوارد دا، کەچی لەو کاتەوە چاوم پێی نەکەوتووە.

بەر لەوەی ماسیەکە بگرێت، کلاوە پووشینەکەی تەپاندبووە سەری و، ئەوەتا ئێستە تەوێلی ڕووشاندووە و دەیکزێنێتەوە، جا با تینوویەتیش لەولاوە بوەستێت کە بە تەواوی بڕستی لێ بڕیبوو. کەوتە سەر چیچکان و بە پارێزەوە و لە خەمی ئەوەی پەتەکە بە دەستیەوە بەر نەبێت، بە قنگەخشێ خۆی گەیاندە پێشکۆی بەلەمەکە و جا دەستی بۆ شووشە ئاوەکە درێژ کرد، سەرەکەی کردەوە و چەند قومێکی لێ خواردەوە. دواتر پالی دایەوە و پشوویکی کرد. لەسەر چارۆکە لە ئەستوون پێچراوەکە دانیشت و هەولی دا مێشکی خۆی بە هیچ شتێکەوە سەرقال نەکات و تەنها پشوودرێژ و چاوەوکانە بمێنێتەوە.

ئاوڕی دایەوە و هەرچەند ورد بووەوە هیچ ئاسەوارێکی وشکانیی بەدی نەکرد، لە دلی خۆیدا گوتی:

- ئەمە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ، چونکە دەتوانم بە ڕووناکییەکانی هاڤانا بگەڕێمەوە. دوو کاتژمێری تر خۆر ئاوا دەبێ و پێدەچێ تا ئەوکات ماسییەکە بێتە سەرەوە. گەر تا ئەو کاتەش نەهات، بێ شک لەگەڵ دەرکەوتنی مانگدا دێ، یا بڵێین ئیه.گەر خوا نەیکرد و ئەو کاتەش نەهات، ئەوا بێ دوودڵی لەگەڵ گزنگی بەرەبەیاندا دێ. منم ئەوەتا هیچ هەست بە شەکەتی ناکەم! بە پێچەوانەوە، بگرە هەست بە گوڕوتین و هێزێکی زۆر دەکەم لە ناخمدا. ئێ قابیلە خۆ ئەو قولاپەکەی قوتداوە نەک من! دەبێ چ ماسییەکی شکۆدار بێ کە وا بە شوێن خۆیدا کێشم دەکا. دڵنیام کە ئێستاکە توند ددانی لە پەتەکە جیڕ کردووەتەوە و گرتوویەتی. ئای ئای، چەندە خوازیارم کە ببینم، هەر بۆ ساتێک، یەک سات و زیاتر نا، بەس ئەوەندە چاوێکی لێ بکەم تا بزانم لەگەڵ کێدا تێگیراوم.

بە درێژایی شەو *مارلین* ڕێچکە و ئاراستەی خۆی نەگۆڕی، ئەمە ئەو ئەنجامگیرییەی پیرەمێرد بوو، کە لە ڕێی سەرنجدانی ئەستێرەکانەوە پێی گەیشتبوو. هەر دوای خۆرئاوابوون هەوای ئەو دەر و ناوە سارد و تەزێنەر دادەهات، ئارەقەی پشت و باسک و قاچە پیرەکانیی بە جەستەیدا وشک بووبووەوە. بە درێژایی ڕۆژەکە ئەو گوونییەی کە بەسەر سندووقی چەشەکاندا دابووی، لە بەر خۆر هەڵخستبوو تا وشک ببێتەوە، بۆ شەوەکەشی لە شان و ملییەوە دەپێچا و ئەو چمکەشی کە بە پشتیدا شۆڕ دەبووەوە، لێزانانە دەیخزاندە ژێر ئەو پەتەی کە هەنووکە بەسەر شانەکانیەوە بوو. بەم جۆرەش دەبووە پەتۆیەک بۆی و هیچ نەبێ لە ئازار و دابڕینی شان و ملی

دەپاراست. هەر ئەوەندەش نا، بەڵکو ئێستاکە دەیتوانی بێ هیچ ئاستەنگییەک بەرەو پێش بچەمێتەوە و ئێستێک بکات. هەرچەندە خۆی پێی وابوو کە شوێنەکەی تەواو ئاسوودەییهێنە و حەساوەتەوە، وەلێ تەنها ئەوە بوو بەم جۆرە کەمتر ئازاری دەچەشت و هیچی تر، ئەگینا بە تەواوی ئاسوودە نەبوو. جا لە بەرخۆیەوە گوتی: «تا بەم جۆرە بەردەوام بێ، نە من دەتوانم فێڵی لێ بکەم و دەستی خۆم بوەشێنم، نە ئەویش.»

قەیرێک هەستایە سەر پێ و لە قەراغی بەلەمەکەدا بەدەم میزکردنەوە سەرنجێکی ئەستێرەکانی دا، تاکو ئاراستەی ڕۆیشتنەکەی دیاری بکات. پەتەکەی سەر شانی کە بە نێو ئاوەکەدا درێژبووبووەوە، بە شێوەیەکی فۆسفۆری ئاورینگی دەدا و تا دەهات خێرایی بەلەمەکەش هێواش و هێواشتر دەبووەوە و ڕووناکییەکانی هاڤانا‌ش تەنها تروسکایەکیان بە دەرەوە مابوو، هەر بەمەشدا زانی کە تەوژمەکان ڕاپێچی خۆرهەڵاتی دەکەن. لە دڵی خۆیدا گوتی: «گەر یەکجارەکەی ڕووناکی هاڤانا لە چاو ونبوو، مانای وایە زیاتر بەرەو خۆرهەڵات دەڕۆین، چونکە گەر ماسییەکەش هەر بەو جۆرە بمێنێتەوە و یەکڕاست مل بنێ، دەبێ تا چەند کاتژمێرێکی دیکەش ڕووناکی و پرشنگی هاڤانا بە دەرەوە بمێنێ. خۆزگە ئەنجامی یارییەکانی بەیسبۆڵی ئەمڕۆم دەزانی. ئای چەندە خۆش دەبوو گەر بەدەم ئەم ڕاوکردنەوە، ڕادیۆیەکیش هەبووایە هەواڵەکانی بەیسبۆڵی بگواستایەتەوە. هەموو دونیای دەهێنا!» پاشان بە خۆی گوت: «تۆ بیر لەوە بکەوە کە بۆی

هـاتووی، بیـرت شـپرزه مەکە و وریـا بە کە هـیچ کـارێکی گەمژانە نەکەی.»

جا بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- خۆزگە بە خۆزگای خوا ئێستە کوڕەکەم لەگەڵ دەبوو، هەم دەستێکی یارمەتیی بۆ درێژ دەکردم، هەم ئەمەیشی دەبینی.

بیـری کـردەوە: «نـاکرێ کەسـێکی بەسـاڵاچووی وەک مـن بە تـاقی تەنیـا لەم زەریـایەدا بـێ، وەلـێ چـار چییە! پێویسـتە تـا ماسـییە تـونەکەش خـراپ نەبـووە بیخـۆم، ئەوە تینوتـاو و گوڕوتینی جەستەم دەهێڵێتەوە. بیرت نەچێ، برسییت بێ یا نا، پێت خۆش بێ یان نا، سبەی بەیانی دەبێ بیخۆی، تێگەیشتی!»

شـەو بە تەواوی داهـاتبوو، دوو بەرازی زەریـایی مرقەمـرق بەرەو بەلەمەکە هـاتن، پیرەمێـردەکە گـوێی لە مرقەمرقـی تەراتێنیـان بـوو، هەر بە دەنگەکانیانـدا دەیتـوانی مـێ و هەناسەبڕکێی خێرای نێرەکە لە هیی مالۆسـەکە جیا بکاتەوە. پاشان گوتی:

- چەنـدە جوان و لەبەردڵانـن، خەریکی تەراتێن و گاڵتەوگەپی خۆیـانن و هاوکـات شـەیدا و هـۆگری یەکتریشـن. ئەمـانەش هەروەک باڵندەماسییەکان برا و هاودەمی نزیکی منن.

بەداخ بـوو کە ئەو ماسـییە گەورەیەی گیـرۆدە و وابەسـتەی خـۆی کـردووە. لە دڵـی خۆیـدا گـوتی: «چەنـدە قەشـەنگ و نـازدارە، مەگەر هەر خـوا خـۆی بزانـێ تەمەنـی چەنـدە. بە عەمـراتم ماسـییەکی هێنـدە سـرک و بەهێـز و ڕێچکەسـەیرم نەدیوە، دیارە لەژێری خۆیدایە و نایەوێ باز بدا، چونکە خۆ

گەر توند و سەرشێتانە تەکانێک بدا، ئەوا یەکجاریم دەکا. وەلێ کێ چوزانێ؟ ڕەنگە پێشتر چەندین جار بە قولاپەوە بووبێ و ڕۆژگاری سەختێ لەم چەشنەی زۆر تووش بووبێ، هەر بۆیەش باش دەزانێ کە پێویستە بەم جۆرە بەرەنگار بێتەوە و شەڕی خۆی بکا. جا لەوە خۆشتر ئەوەیە نازانێ کە ڕکابەرەکەی تاقە پیاوێکی سەرسەختە، جا چ پیاوێکیش! پیر و بێپەڕوبال. تا بڵێی ماسییەکی زلە! گەر گۆشتەکەی ناسک جوان بێت، تۆ بڵێی لە بازاڕدا چەندم بۆ بکا؟ بە پەلاماردانی چەشەکاندا بێ نێرە، خۆ گەر بە هێزی ڕاتەکاندن و کێشکردن و بەجەرگیی ڕووبەڕووبوونەوەکەیدا بێ، ئەوا هەر نێرە. ئای خۆزگە دەمزانی کە ئێستە چ پلان و فێڵێکی لەژێر سەردایە! یان ئەویش وەک من سەرگەردان و وێڵە؟»

بیری کەوتەوە کە چۆن جارێکیان جووتە مارلینێک بەرەو چەشەکان هاتن. جا نێرەکان هەمیشە ڕێگە خۆش دەکەن و مێیەکان پێش خۆیان تێر دەکەن. قولاپەکە چەقیە دەمی مێیەکە و دایە هەوڵ و تەقەللای بێهوودە تا خۆی قوتار بکات، وەلێ هەر زوو بڕستی لێ بڕا و کۆڵی دا. جا بە درێژایی ئەو کاتە نێرەکە لە پەنایدا مایەوە، بە نزیک پەتەکەدا دەسووڕایەوە و پشووکورت و تەنگەتاو هەر ئەمسەر و ئەوسەری دەکرد، هێندە نزیک لە پەتەکە دەسووڕایەوە کە پیرەمێردەکە هەر خەمی ئەوەی بوو بە کلکە نووکتێژە داسئاساکەی کە لە شێوە و قەبارەدا کتومت وەک داس وایە، پەتەکە بقرتێنێت. دواتر بە گۆچانەکەی گرتی و بە کوتەکەکە شلکوتی کرد، جا دەموقەپۆزی توند گرت، ئەو دەموقەپۆزەی کە وەک ڕم درێژ و نووکن بوو و وەک سمارتەش زبر. بەردەوام و بێ وەستان

دەیکێشا بە تەپڵە سەریدا، تا یەکجارەکی شل بوو و ڕەنگی وەک ئەو کانزایە چووەوە کە پشت ئاوێنەی پێ دەڕازێننەوە. پاشان لەگەڵ کوڕەکە ڕایانکێشایە ناو بەلەمەکە و تا ئەو ساتەش نێرەکە هەر بە دەوروپشتی بەلەمەکەدا دەسووڕایە. پیرەمێردەکە دەستی کرد بە هەڵکردنەوەی پەتەکە و گۆچانە قولاپییەکەی، ئەوەندەی زانی ماسییە نێرەکە بە پرتاو لە ئاوەکەدا دەرپەڕی و لە هەوادا سەرەتاتکێیەکی کرد تا بزانێت مێیەکەی لە کوێیە، ئینجا خۆی بەنێو ئاوەکەدا کردەوە. پەڕە شینکارەکانی سنگیی بڵاو کردنەوە و تێکڕای هێڵە پانە ڕەنگ وەنەوشەییەکانی جەستەی دەرکەوتن. چەندە دڵگیر و جوان بوون! چەند بەوەفا و دڵسۆز بوو! پیرەمێردەکە هەرگیز ئەوەی بیر نەدەچووەوە.

پیرەمێرد لە بەرخۆیەوە گوتی: «ئەمە کارەساتبارترین و ناخۆشترین بەسەرهات بوو کە لەگەڵ مارلینەکاندا بەسەرم هات، کوڕەکەش لێوڕێژ بوو لە خەم و حەسرەت بۆ ماسییەکە. دواتر داوای لێخۆشبوونمان لە ماسییەکە کرد و هەڵمان دڕی.»

«خۆزگە کوڕەکەم لەگەڵ دەبوو» ئەمەی بە دەنگێکی بەرز گوت و لەسەر تەختەکانی پێشکۆی بەلەمەکە دانیشت، بە پەتەکەی سەرشانیدا، هەستی بە بەهێزی و گەورەیی ماسییەکە دەکرد، کە بەردەوام بەرەو ئەو جێیەی کە دەیویست پیرەمێردەکەی کێش دەکرد. بیری کردەوە: «من تووشم کرد، گەر فرتوفێڵەکانی من نەبووایە قەت خۆی تووشی ئەم بەزمە نەدەکرد. تەنها دەیویست بێوەیی و دوور لە هەموو قولاپ و تەڵەیەک لە قووڵاییدا بە دەردی خۆیەوە بژی. کەچی دواجار

من هاتم و بڕیارم دا دوور لە هەمووان، لە هەموو مرۆڤێکی سەر ئەم زەمینی خوایە، بە شوێنیدا بگەڕێم و بیدۆزمەوە. ئەوەتا هەنووکەش هەردووکمان پێوە بووین و کەسیش نییە دەستێکی یارمەتیمان بۆ درێژ بکا».

لە دڵی خۆیدا وتی: «هەر لە سەرەتاوە دەبوو من ماسیگر نەبوومایە، وەلێ ئەوە تاکە شتە کە بۆی خولقاوم. بەهەرحاڵ، پێویستە بیرم نەچێ کە بەر لەوەی ڕۆژم لێ ببێتەوە، ماسیە تونەکە بخۆم.»

پێش خۆرهەڵاتن شتێک دەمی لە چەشەکانی دواوەی دا، تۆوڵەکە پەڕی و پەتەکەش بە شوێنیدا کەوتە سەر ڕووی بەلەمەکە. لە تاریکیی نووتەکی شەودا چەقۆکەی لە کیفەکەی دەرکرد و چەمییەوە، هەموو قورسایی ماسییەکەی خستبووە سەر شانی چەپی و لەسەر تەختەی لێواری بەلەمەکە پەتەکەی قرتاند و جا ئەو پەتەش کە لە پەنایەوە بوو. لەو شەوەزەنگەدا بە یەک دەست لێزانانە و بە پارێزەوە سەری هەردوو پەتە یەدەگەکەی بەیەکەوە گرێدا، توند پێی خستبووە سەر پەتەکان و گرێکانی توند دەکردەوە. بەم جۆرە شەش گلۆلە پەتی زیادەی مسۆگەر کرد، دووان لەو پەتانەی کە بڕیبوونی، دووانیش لەوانەی ماسییەکەیان پێوە بوو و، پێکڕای ئەمانەش بەیەکەوە گرێدرابوون. جا لەبەرخۆیەوە هەڵی دایێ: «هەر کە ڕۆژ بووەوە دەستوبردێ دەکەم، دەچم ئەو پەتەش دەبڕم کە چل باڵا درێژییەکەیەتی و بەوانی دیکەوە گرێی دەدەم. بەم جۆرەش سەد باڵا لە پەتی *قەتلۆنی* باشم لەدەست دەچێ، ئەمە وێڕای قولاپەکانیش، وەلێ هەموو ئەمانە دەکرێ قەرەبوو بکرێنەوە، بەس ئەگەر ماسییەکی دیکە ببێ بە قولاپێکیانەوە و

ئەم بەرەڵا بکـــات، ئەوســـاکە کـــێ قەرەبـــووی ئەم ماســـییە گەورەیەم بۆ دەکاتەوە؟ نازانم ئەمە چ جۆرە ماسییەک بوو کە ئێســـتە چەشـــەکەی قـــوت دا: تیرەماســـییە، ماســـییەقەپۆزەیە، قرشە؟ من هەر دەستم لێ نەدا تا هەستی پێ بکەم و بزانم کامیانە، هەر ئەوەندەم بە پێویست زانی، کە بە زووترین کات لە کۆڵ خۆمی بکەمەوە.» دواتر بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- خۆزگە کوڕەکەم لەگەڵدا دەبوو!

بیری کردەوە: «بەڵام لەگەڵت نییە، خۆ بە زۆر نییە، کەست لەگەڵ نییە و تەواو، بەس خـۆتی! بـۆیە باشـترە بچـێ بەلای کاری خۆتەوە و شەوەزەنگ بێ یان نا، دەبێ ئەو کۆتا پەتەی کە ماوە، بقرتێنی و بیخەیتە سەر دوو گلۆلەکەی دیکە.»

دروست بەو جۆرەی کرد کە گوتی. کـارێکی گـران بـوو لە تاریکییدا و، لەو کاتەشدا ماسییەکە بە گوڕمەوە خۆی ڕاتەکاند و دەموچـاوی پیرەمێـردەکەی کـوتی بە تەختـەی بەلەمەکەدا، برینێک کەوتە خوار چاوییەوە، دەزوولەیەکی باریکی خوێن بە گۆنایـدا داچـۆڕایە خـوار، وەلـێ پـێش ئەوەی بگـاتە قـۆرتی چەنـاگەی مەیـی و وشـک بـووەوە. پیرەمێـردەکە چـووەوە پێشکۆی بەلەمەکە و پاڵی دایەوە تا هەناسـەیەک وەبەر خۆی بهێنێتەوە. گونییەکەی سەر شانیی ڕێک کردەوە، بە وریاییەکی زۆرەوە پەتەکەی گواستەوە جێیەکی دیکەی ناوشـانی و تونـد گرتی، هەستی بە ڕاکێشـان و بەهێزیی ماسییەکە دەکرد. چـا دەستێکی وەردایە ئاوەکە و خێرایی بەلەمەکەی مەزەندە کرد.

«خـۆزگە دەمزانـی بـۆ ئـاوا ڕای تەکانـدم؟ ڕەنـگە قـولاپە ئاسنینەکە تـا پشـتە گردئاسـاکەی ڕۆچـووبێ. خۆ ڕوونە کە

پشتی بەقەد هیی من کوڵەوار نییە. گرنگ نییە چەندە بەشان و شکو و مەزنە، خۆ ناتوانێ بۆ ئەبەد ئەم بەلەمە بە شوێن خۆیدا کێش بکا. هەرچۆنێک بێت ئێستە هەموو ئەو شتانەی بەردەستیان گرتبووم لە کۆڵم بوونەوە. بڕێکی زۆریش گلۆلە پەتی زیادەم هەیە، لەوە زیاتر چی؟» جا بە دەنگێکی بەرز بە ماسییەکەی گوت:

- ئەی ماسییەکە، تا سەرەمەرگ لەگەڵتدا دەمێنمەوە!

بیری کردەوە: «پێم وابێ ئەویش بە هەمان شێوە لەگەڵ مندا دەمێنێتەوە.» جا چاوەڕوانیی هەڵهاتنی خۆری کرد. دەمەوبەیان هەواکەی بێئەندازە سارد بوو، پیرەمێردەکەش لە سەرمادا خۆی بە تەختەی بەلەمەکەوە نووساندبوو. «تا ئەو بمێنێتەوە، منیش دەمێنمەوە.» لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم پرشنگی خۆردا پەتەکەی بینی کە لارووێژ بە قووڵایی ئاوەکەدا شۆڕبووبووەوە. یەکەم تیشکی خۆر بەر شانی ڕاستی پیرەمێردەکە کەوت و بەلەمەکەش هەروا ڕێک و ڕاست ڕێی دەکرد. پاشان گوتی:

- ئێستە بەرەو باکوور دەڕوا.

بیری کردەوە: «دەکرا ڕێگە بدەین تەوژمەکان دوور بەرەو خۆرهەڵاتمان بەرن. شای چەندە خوازیارم ماسییەکە هەڵگەڕێتەوە و بە ئاراستەی تەوژمەکان مەلە بکا، چونکە ئەوکات دەیسەلمێنێ کە بڕستی لێ براوە و تەواو شەکەتە.» خۆر زێدە بەرەو ژوور هەڵکشا و هیچ نیشانەیەکی شەکەتی بە ماسییەکەوە دیار نەبوو. تاکە ئاماژەیەکی دڵخۆشکەر، ئەوەبوو

که هەنووکە ماسییەکە لە قووڵییەکی کەمتر لە چاو پێشوو مەلەی دەکرد. ئەمەش ئەوەی نەدەگەیاند کە ئیدی دەبێ ڕاپەڕێت و بێتەوە سەر ڕووی ئاوەکە، وەلێ دواجار ئەگەرێکی هەبوو. پیرەمێردەکە گوتی:

- خوایە وای لێبکە باز بدا و هەڵبەزێ! بەشی ئەوە پەتم هەیە کە بەرەنگاری ببمەوە.

بیری کردەوە: «ڕەنگە گەر کەمێک پەتەکە توند ڕاکێشم ئازاری بدات و ناچار بە دەرپەڕینی بکات. هەنووکە ڕۆژ بووەتەوە و چاکترە باز بدا، تا ئەو کیسانەی کە بە درێژایی پشتی درێژ بوونەتەوە پڕ لە هەوا بکا. ئیدی ئەوسا دەرفەتێکی دیکەی بۆ نایەتە پێش تا خۆی بکاتەوە بە بنی زەریادا و لەوێ بمرێ.» ویستی کەمێ پەتەکە ڕابکێشێت، وەلێ پەتەکە بێئەندازە توند بووەوە و ئەگەری قرتانی هەبوو. پیرەمێردەکە بەرەو دوا وەرچەرخا و گەرەکی بوو ڕایکێشێت، وەلێ هەستی بە جۆرە سەختیی و جیڕییەک کرد و، هەر زوو تێگەیشت کە لەوە زیاتر نابێت ڕای بکێشێت. بیری کردەوە و گوتی: «پێویستە بە هیچ جۆرێ ڕای نەکێشم، چون لەگەڵ هەر ڕاکێشانێکدا برینەکە زیاتر دەم دەداتەوە، ئەوسا گەر ماسییەکە تەکان بدات، ئەوا یەکەلای دەکاتەوە و قوتاری دەبێ. بەهەرحاڵ، تیشکی خۆر گوڕوتینێکی تازەم بە بەردا دەکا، بۆ یەکەم جاریش لە ژیانمدا پێویست ناکا لە چرووچاوی بڕوانم.»

گژوگیا زەردەڵەکان بە پەتەکەوە گیرسابوونەوە، پیرەمێردەکە گەلێک کەیفی بەمە دەهات، چونکە ئەمەش بارگرانییەکی دیکە بوو و کەوتبووە سەر شانی ماسییەکە. هەر ئەم گیا زەردەڵە

کەنـداویانەش بـوون کە بە درێژایـی شـەو فۆسفۆرئاسـا دەبرسکانەوە. پاشان ڕووی قسەکانی کردە ماسییەکە و گوتی:

- ئەی ماسـییەکە، مـن خۆشـم دەوێی و ڕێزیشـت بـان چـاوم، وەلێ پێش ئەوەی خۆر ئاوا بێ تەختت دەکەم!

ئینجا لە دڵی خۆیدا گوتی: «خوا بکا وا دەرچێ!» باڵندەیەکی چکـۆلە لە بـاکوورەوەڕا بە بـاڵەفڕێ بەرەو بەلەمەکە هـات. فیڕنەگولەیەکـی خۆشـخوان بـوو، نـزمنـزم بەسـەر ڕووی ئاوەکەوە دەفڕی و پیرەمێردەکە دەمودەست زانیی کە باڵندەکە زۆر مانـدووە. لە پشـتەوەی بەلەمەکە هەڵکوڕمـا و قەیرێـک حەسـایەوە، پاشـان کەوتەوە بـاڵەفڕێ و سـووڕانەوە بەدەور سـەری پیرەمێـردەکەدا، سـەرئەنجام لەسـەر پەتەکە و لەو جێـیەی کە زیـاتر بـۆی ئاسـوودەییبەخش بـوو گیرسـایەوە. پیرەمێرد لە باڵندەکەی پرسی:

- تەمەنت چەندە باڵندە؟ ئەمە یەکەم گەشتتە؟

باڵندەکە چاوە بچووکەکانی بڕیبوونە پیرەمێردەکە و ئەویش قسـەی بـۆ دەکـرد. بە ڕادەیەک شـەکەت بـوو کە سـەرنجی پەتەکەی نەدەدا، ناوبەنـاو بەمـلاو بەولادا ڕەتـی دەبـرد و بە چرنـووکە چکۆلەکـانی قـایم پەتەکەی گرتبـوو. پیرەمێـردەکە دووبارە لەگەڵیدا کەوتەوە قسە:

- خـاترجەم بە و مەترسـە، زۆر تـۆکمە و تونـدە، بێئەنـدازە تونـدە. هەرچۆنێـک بـێ نەدەبـوو دوای شـەوێکی وا هـێمن و باخستوو، بەم جۆرە شەکەت و ماندوو بی. چ شتێک باڵندەکان ناچار دەکا هەڵبێن؟

لە دڵی خۆیدا گوتی: «بازەکانن، بازەکان دێنە پانتایی زەریا تا بیانگرن.» وەلێ ئەم قسانەی نەدا بە گوێی باڵندەکەدا، چونکە خۆ دواجار لێیان تێنەدەگەیشت، وێڕای ئەوەش بەم زووانە خۆی بەشی پێویست سەبارەت بە بازەکان فێر دەبێت.

بە باڵندە بچووکەکەی گوت: «ئەی باڵندەی چکۆلە، باش بحەسێرەوە، ئینجا بەرەو کەنار زەریا بڕۆ و دەرچۆ و، شەرەفمەندانە وەک هەر پیاو و باڵندە و ماسییەک شانسی خۆت تاقی بکەرەوە.»

قسەکان هاندانێک بوون بۆ ئەو، چونکە پشتی ڕەق بووبوو و تەواو ناڕەحەتی کردبوو. دواتر گوتی: «گەر پێت خۆشە لە ماڵی مندا بمێنەرەوە، وەلێ شەرمەزار و خەجاڵەتم کە ناتوانم چارۆگەکە هەڵدەم و لەژێر باڵی ئەم شەماڵە کزەدا بتگەیەنمەوە کەنار، وەک دەبینی برادەرێکی ئازیزم لایە!»

لەو ساتەدا ماسییەکە تەکانی دا و پیرەمێردەکەی ڕاپێچی پێشکۆی بەلەمەکە کرد، گەر پەتەکەی لە دەستیدا شل نەکردایە و توند خۆی بە قەراغی بەلەمەکەوە نەگرتایە، لەوەدابوو بە یەک گوژم فڕێی بداتە نێو ئاوەکەوە.

دروست لەو ساتەدا کە پەتەکە جووڵا، باڵندە ڕاچەنی و لە شەقەی باڵی دا و لە کاتی ڕۆیشتنیدا پیرەمێردەکە هەر چاویشی پێی نەکەوت. بە دەستی ڕاستی توند پەتەکەی گرتبوو، پاشان سەرنجی دا دەستی خوێنی لێ دەچۆڕێ. «ئەمە واتە شتێ برینداری کردووە.» بە دەنگێکی بەرز ئەمەی گوت و پەتەکەی ڕاکێشا تا بزانێت لە توانایدا هەیە ماسییەکە هەڵگەڕێنێتەوە، وەلێ هەر ئەوەندەی خەریکبوو بگاتە خاڵی

پچڕان دەستی هەڵگرت و، توند بەرەو دوا خۆی چەماندەوە تا بەرهەڵستیی کێشی ماسییەکە بکات. ئینجا گوتی:

- ئێستە هەستت بە ئازارەکەی کرد ها ماسییەکە! خوا ئاگادارە منیش خراپ ئازارم پێ گەیشت.

بە چواردەوری خۆیدا چاوی بۆ چۆلەکەکە گێڕا، چونکە حەزی دەکرد هاودەمێکی هەبێت، وەلێ ئەفسووس چۆلەکەکە ڕۆیشتبوو. لە بەرخۆیەوە گوتی: «زوو بوو بۆ ڕۆیشتن ئەی باڵندە، وەلێ تا دەگەیتە کەنار زەریا، ڕێگەکەت دژوار دەبێ. باشە من چۆن هێشتم ئەو ماسییە ئاوا ڕامتەکێنێ؟ گومانی تێدا نییە بیرم پەرت بووە و داوەمەتە هێڕی و گێژیەتی! یانیش دەکرێ لەو ساتەدا و بەدەم تەماشاکردنی باڵندەکەوە، خەیال بردیتمییەوە. ئێستە مادام وای لێ هات پێویستە زۆر بە وریاییەوە کار بکەم و ماسییە تونەکەش بخۆم، تا هێز و تینی خۆم لەدەست نەدەم. بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- خۆزگە کوڕەکەم لەگەڵ بووایە، خۆزگە کەمێ خوێم لەگەڵ خۆمدا بهێنایە!

قورسایی پەتەکەی گواستەوە سەر شانی چەپی و هێدیهێدی کەوتە سەر ئەژنۆ، دەستی لە ئاوی ئۆقیانووسەکەدا شت و زیاد لە خولەکێک تێیدا هێشتیەوە، لە تنۆکە خوێنەکانی دەڕوانی کە بەسەر ڕووی ئاوەکەوە پەرش و بڵاو دەبوونەوە و، جووڵەی ئاوەکەش کە بەدەم ڕێکردنی بەلەمەکەوە، ساف و بێ گرێ بەنێو پەنجەکانیدا دەڕۆیشت. پیرەمێردەکە گوتی:

- زۆر هێواش بووەتەوە.

حەزی دەکرد بۆ ماوەیەکی درێژتر دەستی لە ئاوە سوێرەکەدا بهێڵێتەوە، وەلێ زاتی نەدەکرد و ترسی ئەوەی هەبوو ماسییەکە هەمدیس ڕاپەڕێت، هەر بۆیە دەستی گەیاندە سووچێکی بەلەمەکە تا هاوسەنگیی خۆی ڕاگرێت، جا هەستایەوە سەر پێ و لە بەر خۆرەکەدا دەستی هەڵبڕی. قەراغی پەتەکە پێستی دەستیی زامدار کردبوو و برینەکەش ڕێک کەوتبووە ناو لەپی دەستییەوە. باش دەیزانی تا کۆتایی ئەم بەرەنگاری و کێشمەکێشە پێویستی بە هەردوو دەستی دەبێت، هەر لەبەر ئەمەش بوو زامداربوونی دەستی گەلێک لە بەردڵ گران بوو. هەر کە دەستی وشک بووەوە گوتی:

- ئێستە دەبێ ئەم تونە چکۆلەیە بخۆم. پێویست ناکا بجووڵێم و بڕۆم بیهێنم، هەر لێرەوە بە گۆچانەکە ڕایدەکێشمە بەردەمم و بە ئیسراحەت بۆی دادەنیشم و دەیخۆم.

بەرەو پێش نووشتایەوە و بێ ئەوەی بهێڵێت بەر گلۆلە پەتەکان بکەوێت بە گۆچانە قولاپییەکەی ماسییەکەی لەژێر تەختەی دواوەی بەلەمەکە ڕاکێشا. بە پشتبەستن بە دەستی و باسکی چەپی، پەتەکەی دووبارە گواستەوە سەر شانی چەپی، ماسییەکەی لە سەری گۆچانەکە کردەوە و گۆچانەکەی خستەوە شوێن خۆی. جا ئەژنۆیەکی خستە سەر ماسییەکە و بە باری درێژیدا، هەر لە پشتەملیەوە تا کلکی، گۆشتە ڕەنگ سوورە تێرەکەی لێکردەوە. گوڵمە گۆشتی شێوە درێژ و مێخی بوو، کە لە بڕبڕەی پشتییەوە تا لێواری سکی لێی کردبووەوە. هەر کە شەش پارچە گۆشتی لێکردەوە، لەسەر تەختەی بەلەمەکە ڕایخستن و چەقۆکەی بە پانتۆڵەکەی سڕی، پاشان ئێسکەپەیکەری ماسییەکەی بە کلک بەرز کردەوە و تووڕی

دایە ئاوی زەریاوە. «بڕوا ناکەم یەک پارچەشم پێ بخوریێ.» ئەمەی گوت و نووکی چەقۆکەی لە پارچەیەکیان گیر کرد. هەستی بە زەبر و قورسایی پەتەکە دەکرد و دەستی چەپیشی کفت بووبوو. قایم پەتەکەی گرتبوو و بە تەنز و حەژمەتەوە سەرنجێکی دەستی دا و گوتی:

- تۆ چ جۆرە دەستێکی؟ کفت[1] بە گەر دەتەویێ! وەک چرنووکی باڵندەیەک خۆت بهێنەرەوە یەک، چونکە هیچ شتێک دادت نادا!

تەماشایەکی پەتە لاربووەکەی کرد و بە خۆی گوت: «دەی، هەر ئێستە و بێ چەندوچۆن ئەم گۆشتی ماسییە بخۆ، چونکە هێز و توانا بە دەستت دەبەخشێ. خەتا خەتای خۆتە و هی دەستەکە نییە، بۆ ماوەیەکی دووردرێژ لەگەڵ ماسییەکەدا مایتەوە. کێ چوزانێ! ڕەنگە بۆ ئەبەد لەگەڵیدا بمێنیەوە. دەی ئێستە ماسییەکەت بخۆ.»

کوتە گۆشتێکی ئاخنییە دەمی و لەسەرخۆ جوویی، بەو ڕادەیەش ناخۆش نەبوو کە بیری لێ دەکردەوە. جا لە بەرخۆیەوە گوتی: «باش بیجوو و تەڕایی تیا مەهێڵە. خۆ پیاو گەر لەگەڵ لیمۆیەک، پرتەقاڵێک، تۆزقاڵێک خوێدا بیخواردایە باشتر و بەتامتریش بوو.» دواتر کەوتە پرسیارکردن لە دەستە کفتبووەکەی، کە ئەوەندەی نەمابوو وەک دەستی مردوویەک ڕەق و بێخوێن هەڵگەڕێت: «ئەی دەست، چۆنی چۆن؟ قەیناکە، ئەوەتا لەبەر خاتری تۆ کەمێکی دیکەش

[1] کفتبوون: کشەنگبوون و گرژبوونی ماسولکەکان بۆ ماوەیەکی کاتی، بەهۆی ماندووبوون و فشاری زۆرەوە.

دەخۆم.» ئەو پارچەیەی خوارد کە کردبووی بە دوو کەرتەوە، بە شێنەیی جوویی، پاشان پێستەکەی تف کردەوە.

- ئەی ئێستە حاڵت چۆنە ئەی دەست؟ یان هێشتا زووە تا ئەمە بزانم؟

کوتە گۆشتێکی تری ئاخنییە دەمییەوە و جویی. لە بەرخۆیەوە گوتی: «ئەم تونەیە سەراپا خوێنە. خوا ڕەحمی کرد ئەمەم ڕاوکرد و دۆلفینێک پێوە نەبوو، چونکە گۆشتی دۆلفین بێئەندازە شیرینچک و کەمخوێیە. وەلێ ئەم تونەیە ئەوەی تێدا نەبێ شیرینییە و، هێشتا وزە و تەڕیشی تێدا ماوە.» جا بیری کردەوە: «هەرچۆنێک بێ ڤیروسیا، ئەوەی گرنگە خواردنیەتی. ئای چەند باش دەبوو گەر شتێ خوێم هەبووایە. نازانم، تۆ بڵێی ئەوەشی لێی ماوەتەوە خۆرەکە وشکی نەکاتەوە؟ یان یەکجاری خراپی نەکا؟ نازانم، هەر بۆیە باشترە هەمووی بخۆم، لە کاتێکیشدا کە برسیم نییە. ماسییەکەش لەسەرخۆ و بێدەنگە، هەموو تونەکە دەخۆم و بەو جۆرە بە تەواوی تەیاری کار دەبم.» ئینجا گوتی:

- خۆڕاگر بە ئەی دەست! هەموو ئەمە لەبەر تۆ دەکەم.

لە بەرخۆیەوە گوتی: «خۆزگە دەمتوانی ئەویش تێر بکەم! ئاخر ئەو برامە. وەلێ پێویستە بیکوژم و بۆ ئەمەش دەبێ بە بەهێزی بمێنمەوە.» لەسەرخۆ و زیتەڵانە هەموو کوتە گۆشتەکانی خواردن. خۆی گورج کردەوە و دەستی بە پانتۆڵەکەی سڕی، پاشان گوتی: «ئێستە دەتوانی پەتەکە بەر بدەی ئەی دەست! جارێ دەتوانم بە دەستی ڕاست جڵەوی بگرم، تاکوو تۆ واز لەم بەزمە قۆڕانەت دێنی.» پێی چەپی

خسـته سـەر پەته بارقوورسـەکە، کە بە دەسـتی ڕاست گرتبـووی. جـا بـۆ بەرھەڵسـتیکردنی ھێـزی پەتەکە خـۆی بە پشـتدا خسـت، تـا کەمـێ سـڕی و ئـازاری پشـتی بـڕەوێتەوە. پاشان گوتی:

- خوایە یـارمەتیم بـدە تـا ئەم دەسـتە بیمـارەم چـاک بێتەوە. چونکە نازانم ئەم ماسییە بەتەمای چییە!

لە دڵی خۆیدا گوتی: «وا دیـارە ھێندیھێندی شـوێن پلانەکەی خـۆی دەکەوێ.» جـا دووبـارە بیـری کـردەوە: «وەلـێ دەبـێ پلانـی ئەو چـی بـێ؟ ئەی پلانـی مـن چـییە؟ پێویسـتە پلانـێ دابڕێژم کە لەگەڵ ھـی ئەودا بێتەوە، چـونکە ئێجگـار گەورەیە. خـۆ ئەگەر ھەوڵـی دەرپەڕینـیش بـدا بـێ چەنـدوچۆن تەختـی دەکەم، وەلێ ئەو پێی باشە تاھەتایە لە قووڵاییەکاندا بمێنێتەوە، ھەر بـۆیە منـیش تـا ئەبەد لە قووڵاییـدا لەگەڵـی دەمێـنمەوە.» دەسـتە کفتبـووەکەی بە پـانتۆڵەکەی خورانـد و ویسـتی کەمـێ پەنجەکانی نەرم بکاتەوە، وەلـێ ھەرچەنـد کۆشـی و ھەوڵـی دا، بێھـوودە بـوو و نەکـرانەوە. بیـری کـردەوە: «ڕەنـگە ھەر کە تیشـکی خۆریـان بەرکەوت بکرێنەوە، یـاخود دەکـرێ ئەو کـاتە بکرێنەوە کە گۆشتی تونەکە بە تەواوی ھەزم دەبێ. گەر ناچار بـم بە زۆرەملـێ بیـانکەمەوە، ئەوا ھەر دەیـانکەمەوە ئەگەر ئەرزیـش لە ئاسـمانی دابـێ! بەڵام مەسـەلەکە ئەوەیە ھەنووکە نـامەوێ بە زەبروزەنـگ بیـانکەمەوە، بـا خۆیـان ھەرکـات ویستیان بە سرووشتی خۆیان بکرێنەوە. بەھەرحـاڵ، دوێشـەو ئەو کاتەی پێویست بوو پەتەکان ببڕم و پێکەوە گرێیـان بدەم، خراپ ئەزیەتم دا و ناھەقیشی نییە.»

چاوێکی بە زەریادا گێڕا و دەرکی بەو تەنیایی و حەژمەتە کرد کە سەراپای داگرتووە، وەلێ هێشتا چەند ترووسکە ڕووناکییەکی لە قووڵایی ئاوەکەدا بەدی دەکرد. هەروەها چاوی لە پەتە بەرەوپێش کشاوەکە و شەپۆلە کپەکانیش بوو، هەروەها گەواڵە هەورەکان کە ئاماژەیان بە کەوتنی *بای بازرگانی* دەدا. سەرنجێکی پێشەوەی دا و پۆلێک قازی کێویی بینی کە ئاسمانیان تەنیبوو، پەیتاپەیتا ون دەبوون و دووبارە دەردەکەوتنەوە و باش دەیزانی کە مرۆڤ لە زەریادا هەرگیز تەنیا ناکەوێت.

بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن هەندێک کەس ناوێرن لە بەلەمە بچووکەکانیاندا بەرەو پانتایی زەریا بەڕێ بکەون و ڕۆخ جێ بهێڵن. ڕاستە لەو مانگانەدا کە کەشوهەوا خەڵەتێنەر و نەسازە لەسەر هەقن و کارێکی باش دەکەن، وەلێ هەنووکە ئەو دۆخانەمان تێپەڕاندووە و پێمان ناوەتە مانگی گەردەلوول و زریانەوە. ئیدی ئەو کاتانەشی کە هیچ گەردەلوولێک لە گۆڕێدا نابێ، ئەوا کەشوهەوای ئەم مانگە دەبێتە خۆشترین و دڵڕفێنترین کەشی ساڵ. خۆ گەر گەردەلوولێک لە ئارادا بێت پێشوەختە و بەر لە چەند ڕۆژێک بە نیشانەکانی ئاسماندا دەتوانی پێشبینیی بکەی، هەڵبەت گەر لە زەریادا بی. جا هەڵیدایێ و لەبەخۆیەوە گوتی: «ئەوان لە کەنارەکانەوە نیشانەکان نابینن، چونکە نازانن لە چی بڕوانن! لێرەدا با ئەوەش لە بیر نەکەین، ئەو گەواڵە هەورانەی لە کەنارەوە سەیریان دەکەی هەمان ڕەنگ و شێوەیان نییە، کاتێک لە زەریاوە تەماشایان دەکەی، وەلێ هەنووکە هیچ گەردەلوولێ لە ئارادا نییە.»

کەمێک لە ئاسمان ورد بووەوە و سەرنجی ئەو پەڵە هەورانەی دا کە چین‌چین وەک *ئایس کرێم* لەسەر یەک هەڵنیشتبوون، کەمێک بەرزتر و لە سەرووی ئەوانیشەوە، ئەو ڕیشووە هەورانەی بەدی کرد کە سەریان لە کەشکەڵانی ئاسمانی بەرزی ئەیلول دەدا. دواتر بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- شنەیەکی چەندە فێنکە. ئەم کەشە زۆر بۆ من لەبارترە وەک بۆ تۆ ئەی ماسی!

دەستی چەپی هەروەک خۆی کفت بوو و بیمار بوو، وەلێ بەرەبەرە خەریکبوو دەکرایەوە. بیری کردەوە: «ڕقم لە کفتبوونی ماسوولکەکانە، چونکە یەکێکە لە فرتوفێڵە بێماناکانی جەستە. یان بیر بکەوە چەند شەرمەزارییە کاتێ مرۆڤ بەهۆی خۆراکێکی پیسەوە گەدەی تێک دەچێ و تووشی سکچوونێکی پێ‌ئۆمنی دەبێ و لەبەردەم ئەو عالەمەدا دەڕشێتەوە.» بەڵام کەشەنگبوون، بە چاوێکی سووکەوە تەماشای دەکرد، وەک شتێک کە مرۆڤ پێی تەریق دەبێتەوە و دەشکێت، بە تایبەت ئەو کاتانەی تەنیایە.

لە دڵی خۆیدا گوتی: «گەر کوڕەکەم لەگەڵ بووایە، کەمێک دەستی ڕادەوەشاندم و باسکی بۆ دەشێلام. وەلێ ئەوەی ناوێ، هەر خۆی چاک دەبێتەوە، قابیلە بۆ کوێ دەچێ!» بە دەستی ڕاستی و بەر لەوەی سەرنجی گۆڕانکاریی ڕێچکەی ئاوەکە بدات، هەستی بە بارێکی تازە کرد لە قورسایی پەتەکەدا. دواتر کاتێ بەسەر پەتەکەدا چەمییەوە و دەستی چەپی قایم و خێرا کێشا بە ڕانیدا، سەرنجی دا وردەوردە پەتەکە دێتەوە سەرێ.

هاواری کرد: «ئەوەتا دێتە سەرەوە، دەی دەستەکە! دەی تکات لێ دەکەم!»

بە شێنەیی پەتەکە هاتە سەرەوە، ڕووی ئاوەکە کرایەوە، وەک ئەوەی ئۆقیانووسەکە فوو بکات و بە هەموو گوڕی خۆیەوە پاڵ بە شتێکەوە بنێت. ماسییەکە دەرپەڕی، چ دەرپەڕینێک! دوورودرێژ، دەتگوت هەرگیز کۆتایی نایەت. لە هەر چوار لای جەستەیەوە ئاو دەچۆڕا و لە بەرتیشکی خۆردا دەبریسکایەوە. سەر و پشتی ڕەنگێکی وەنەوشەیی تۆخیان هەبوو، هێڵە پانەکانی لاکانیشی، کە جەستەیان نەخشاندبوو، شینێکی کاڵ بوون. ڕمەکەی قەپۆزی ئەندازەی ڕێکتێکی بەیسبۆل درێژبوو و، وەک نووکی شمشێریش تیژ و بڕند. ماسییەکە بە تەواوی لە ئاوەکە دەرپەڕی، جا وەک مەلەوانێکی لەشسووک و چاپووک، نەرم خۆی بەناو ئاوەکەدا کردەوە. پیرەمێرد کلکە درێژە داسئاساکەی بینی کە چووەوە ژێر ئاوەکە و، پەتەکەش وەک پێشووتر بە شوێنیدا کێش کرایەوە. پیرەمێردەکە گوتی: «خۆ دوو پێ لە بەلەمەکە درێژترە!»

خێرا بە شوێن خۆیدا پەتەکەی ڕادەکێشا و ماسییەکە هیچ ئاسەوارێکی شڵەژان و ترسی پێوە دیار نەبوو. بە هەردوو دەستی هەوڵی دا پەتەکە توند ڕابکێشێت و نەبێتە هۆی ترازانی قولاپەکە. باش دەیزانی ئەگەر بە یەک گوژم ڕاینەکێشێت و جووڵەی ماسییەکە پەک نەخات، ئەوا ماسییەکە هەمووی بۆ ئاوەژوو دەکات. بە خۆی گوت: «ماسییەکی گەورەیە، هەر دەبێ بیبەزێنم. نابێ ڕێگە بدەم وەخۆی بکەوێتەوە، ئێ هیچیشی لەدەست نایەت گەر تێی تەقێنێ و ڕابکا. گەر لەجێی ئەو بوومایە، یەکبین بۆی دەردەچووم تا شتێکم دەپساند و

قوتار دەبووم، وەلێ سوپاس بۆ خوا کە بە قەد ئێمەی مرۆڤ، کە دەیانکوژین، ژیر نین. هەرچەندە ئەوان زۆر لە ئێمە جوامێر و بەتواناتریشن.»

پیرەمێردەکە لە ژیانیدا چەندین ماسیی گەورەی بینیبوون. زۆربەی زۆریان هەزار ڕەتڵ زیاتر بوون و دووان لەوانەشی لەوەوپێش ڕاوکردبوون، وەلێ بە تەنیا نا. کەچی ئەوەتا ئێستە تەنیا و دوور لە کەنار و زەوییەکانەوە، گیرۆدەی ماسییەک بووە کە بە تەمەنی نە ماسییەکی هێندە گەورەی بە چاوی خۆی بینیبوو، نە ڕۆژێک لە ڕۆژان لە دەمی یەکێکەوە بیستبووی. سەرباری ئەمانەش، دەستی هێشتا هەروەک چرنووکی بازێکی لەنێچیرگیربوو گرمۆڵە بووبوو. بیری کردەوە: «قابیلە دەگا بە کوێ ئەم کفتبوونەی دەستم، هەر تەواو دەبێ. دڵنیام چاک دەبێتەوە تا یارمەتیی دەستی ڕاستم بدا. ڕاستییەکەی سێ شت هەن کە وەک برا وان: ماسییەکە و دەستەکانی من. ئەرێ، هەر دەبێ بکرێتەوە! چونکە شوورەییە بۆ دەستێکی وەها کە کفت ببێ. ئەوەتا ماسییەکەش هێواش بووەوە و گەڕایەوە سەر خێراییەکەی جارانی.»

پیرەمێرد بیری کردەوە: «تۆ بڵێی بۆچی فڕتەی کردە دەرێ؟ ڕەنگە بۆ ئەوە بووبێ کە شانوشکۆی خۆیم نیشان بدا. بەهەرحاڵ ئێستە دەزانم کە چەندە کەتەیە. خۆزگە دەمتوانی منیش پیشانی بدەم کە چ پیاوێکی بە شانوشەوکەت و ئازام، وەلێ ئەوکات دەستە کفتبووەکەمی دەدی. هەرچۆنێ بێ با هەر وابزانێ مـــن زۆر لەوە جەربەزە و بەشـــکۆترم کە دەردەکەوم، بەو جۆرە هەر بە ڕاستیی دەبمە ئەو کەسەی کە وێنای کردووە.» بەردەوامیی بە بیرکردنەوەکانی دا: «خۆزگە

به خۆزگای خوا من ماسی بوومایه. سەراپای لەشی بەهێز و تۆکمەیە، کەچی من بێ لە ورەبەرزی و ژیری هیچ شتێکی دی شک نابەم.»

پـــاڵی دا بە تەخـــتەی بەلەمەکەوە و پشـــوودرێژانە بەرگەی چەرمەسەری و ئازارەکانی گرت. ماسییەکەش یەکڕاست ملی دەنا و بەلەمەکەش بە شێنەیی بەسەر ئاوە تاریکەکەدا ڕێی دەکرد. زەریا لەژێر کاریگەریی بای ڕۆژهەلاتدا کەمێک هەڵچوو و دەمەونیوەڕۆش دەستی پیرەمێردەکە چاک بووەوە.

«هەواڵێکی ناخۆش هۆ ماسییەکە!» ئەمەی گوت و پەتەکەی گواستەوە بۆ گوونییەکەی سەر شانی. وێڕای ئازار و مەینەتییەکانی، کەچی هەستی بە ئاسوودەییەک دەکرد و، بە هیچ جۆرێک دانی بە هەبوونی ئازاردا نەدەنا. پاشان گوتی:

- من کەسێکی خواناس نیم، وەلێ گەر ئەم ماسییە ڕاو بکەم، ئەوا ویردی *باوەمان* و مریەم دە جار دەخوێنم. تەنها ئەوەش نا، سوێند بێ گەر ڕاوی بکەم، ئەوا بچمە سەر مەزاری مریەمی پاکیزە، با ئەمەیان نەزر بێ لەسەرم.

بەم جۆرە دەستی کرد بە خوێندنی ویردەکانی، هەندێ جاریش ماندوویەتی زۆری بۆ دەهێنا و وشەکانی بیر دەچوونەوە، جا زۆر خێرا و بە شێوەیەکی خۆبەخۆ دەیگوتنەوە. لە بەرخۆیەوە دەیگوت: «*سلاوت لێ بێ ئەی مریەم* لە ویردی *باوەمان* زۆر ئاسانتر دێتە سەر زار و خۆشتریشە.»

«درود بۆ تۆ ئەی مریەم، ئەی لێوانلێو لە پیرۆزیی، خوا لەگەڵتدایە، تۆ لەنێو هەموو ئافرەتانی جیهاندا پیرۆزی، عیسا

مەسیحی نۆبەرەی ناو سکیشت موبارەکە. ئەی مریەمی پیرۆز، نزا بۆ ئێمەی گوناهبار بکە لە ئێستادا و، هەروەها کاتی سەرەمەرگیشمان. ئامین!» پاشان ئەمەی بۆ زیادکرد: «ئەی مریەمی پاکیزە، نزای مەرگی ئەم ماسییەش بکە، گەرچی ماسییەکی ئێجگار نازداریشە.»

هەر کە ویردەکانی تەواو کردن، هەستی کرد حالی باشتر بووە. گەرچی ئازارەکانی زیادیان کردبوو و کەمیان نەکردبوو! بەسەر تەختەی پێشکۆی بەلەمەکەدا چەمییەوە و کەوتە جوولاندنی پەنجەکانی دەستی چەپی. هەرچەندە سووکەشەمالێک هەڵی کردبوو، وەلێ خۆر هەر گەرم و بەتین دەیجۆشاند.

پیرەمێردەکە گوتی: «باشتر وایە ئەو پەتە کورتەی پشتەوەی بەلەمەکە چەشە بکەمەوە و بیهاوێمە ناو ئاوەکەوە، چونکە کێ نالێ ماسییەکە شەوێکی دیکەش نامێنێتەوە! ئەوسا دووبارە ناچار دەبێ شتێک بخۆم و چەند قومێ ئاوی کەمیش لە شووشەکەدا ماوە. لەو بڕوایەدام کە لەم شوێنەدا جگە لە دۆلفین هیچ شتێکی دی بە قولاپەوە نابێ، وەلێ ڕەنگە گەر گۆشتەکەی بە تازەیی بخۆم ئەوا بەو جۆرەش ناخۆش نەبێ. خۆزگە ئەمشەو باڵندەماسییەک دەکەوتە نێو بەلەمەکەوە، وەلێ کێشە ئەوەیە هیچ ڕووناکییەکم پێ نییە تا بەشەوارەیان بخەم. گۆشتی باڵندەماسی گەلێک خۆشقوت و بەلەزەتە و پێویست ناکا لەتیشی بکەی. ئێستە دەبێ هەموو توانا و گوڕوتینی جەستەم بپارێزم. ئاخر یا مەسیح! من نەمدەزانی بەو ڕادەیە گەورەیە.»

پاشــان گــوتی: «لەگەڵ ئەوەشــدا، بەو هەمــوو مەزنــی و جوامێرییەشیەوە، هەر بۆڕی دەدەم[1]!»

بیری کردەوە: «هەرچەند ئەمە نادادپەروەرانەیە، وەلێ نیشانی دەدەم کە مرۆڤ چ کارێکی پێ دەکرێ و، توانای بەرگەگرتنی چ حەژمەت و چەرمەسەرییەکی هەیە.» دواتر گوتی: «خۆ بە کوڕەکەم گوت کە پیرەمێردێکی نائاساییم، ئێستە کاتییەتی کە ڕاستیی قسەکەم بسەلمێنم.» وەک بڵێیت ئەو هەزاران جار سەلماندنەی پێشــووتری، هــیچ گرنگییەکــی ئەوتــۆی نەبێــت، چونکە ئەوەتا هەنووکە دەیەوێ دووبارە پشتڕاستی بکاتەوە. هەر ڕاو و چوونە پانتایی زەریایەک بۆ ئەو ئەزموونێکی نوێ بوو، ئەو دەمانەی کە سەرقاڵی کار دەبوو، بیری لە ڕۆژانی رابردوو نەدەکردەوە.

لە دڵی خۆیدا گوتی: «خۆزگە کەمێ دەنووست، تا منیش سەرخەوێک بشکێنم و خەون بە شێرەکانەوە ببینم.» داخۆ بۆچی شێرەکان تاکە یادگارییەکی گرنگن کە لای ماونەتەوە؟ بە خۆی گوت: «بیر مەکەرەوە پیرەمێرد، بۆ خۆت لەسەر ئەو تەختەیە وچانێک بدە و مێشکی خۆت بە هیچەوە ماندوو مەکە. ئەوەتا ماسییەکە هێندە لە توانایدا هەیە هەوڵ دەدا، تۆیش چاوێک لەو بکە و تا دەتوانی هەوڵ بدە.»

دوانیوەڕۆیە و بەلەمەکەش وەک خۆی، هێواش و ڕاست بەسەر ئاوەکەدا ڕێ دەکات. هەنووکە شنەبای ڕۆژهەڵات یارمەتییەکی دەدا لە پاڵنانی بەلەمەکەدا و، بەم جۆرەش

---

[1] بۆڕدان: بەزاندن؛ زەبوونکردن.

پیرەمێرد هێندیهێندی ڕێی دەکرد و ئازاری پەتەکەی سەر شانیشی کەمێ لە لا سووکتر بووبوو.

سەروەختانی ئێوارە، پەتەکە دووبارە دەهاتەوە سەری. ماسییەکەش لە قوولاییەکی کەمتردا دەیئاژوو، تیشکی خۆر لە باسک و شانی چەپ و پشتی پیرەمێردەکەی دەدا، بەمەدا زانیی ماسییەکە ڕووی کردووەتە باکووری خۆرهەڵات.

لەبەر ئەوەی ماسییەکەی جارێک دیتبوو، ئێستە دەیتوانی بیهێنێتە پێشچاوی کە چۆن بە پەڕە مۆرەکانی سنگییەوە، کە وەک باڵ بڵاوی کردبوونەوە و بە کلکە درێژە گەورەکەی، تاریکیی زەریا شەق دەکات. لە بەرخۆیەوە گوتی: «خۆزگە دەمزانی تا چ مەودایەک توانای بینینی هەیە لەو قوولاییەدا؟ چاوی گەورە و تیژبینە، گیانداری دیکە بەو چاوە بچووکانەوە باش ببینن، دەبێ ئەو چەندە بینایی تیژبێ! سەردەمانێک منیش تیژبین بووم و لە تاریکیدا باش ڕێم دەکرد، مەبەستم چرەتاریکیی نییە. با بڵێم وەک پشیلەیەک دەمبینی.»

جووڵاندنی بەردەوامی پەنجەکانی لە بەرتیشکی خۆردا، وای کرد کەشەنگبوونەکەی لە کۆڵ بێتەوە، بەم جۆرەش دەیتوانی بارێکی قورستر بخاتە سەر ئەو دەستەی. جا کەوتە تەقاندنی ماسولکەکانی پشتی، تا ئازاری پەتەکە کەمێک برەوێنێتەوە. بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- گەر تا ئێستە ماندوو نەبووبێ ماسییەکە، مانای وایە زۆر سەیروسەمەرەی!

تەواو شەکەت بووبوو و دەشیزانی کە شەو هێندەی نەماوە دابێت، هەر بۆیە هەوڵی دا بیر لە شتانێکی جیاواز بکاتەوە.

بیری لە یارییە بەهێزەکانی بەیسبۆل دەکردەوە، دەیزانی کە یانکییەکانی نیویۆرک و پڵنگەکانی دیترۆیدیش ڕووبەڕووی یەکدی دەبنەوە. لە بیری خۆیدا گوتی: «ئەوە ڕۆژی دووەمیش فت و هیچ ئەنجامێکی یارییەکەم نەزانی. وەلێ دەبێ بڕوام بەهێز بێ و گومانم لە مەزنی و توانای *دی ماگیو* نەبێ، کە هەموو کارەکان بە باشترین شێوە ئەنجام دەدا، وێڕای ئەو ئازارەشی کە بەهۆی دەرپەڕینی ئێسکی پاژنەیەوە تووشی بووە.»

لە خۆی پرسی: «وەلێ دەرپەڕینی ئێسک چییە[1]؟ ئێمە هەرگیز تووشی نەبووین. دەبێ هێندەی چوونی درکی قولەپێی کەڵەشێرێک لە کاتی شەڕکردنیاندا بە یەکێکی تردا، بە ئازار بێ؟ ناچێتە ئەقڵمەوە ڕۆژێ لە ڕۆژان تووشی ئەو دەردە ببم، یا چاوێکم لەدەست بدەم، یاخود هەردووکیان و هێشتاش وەک کەڵەشێرێکی جەنگەران[2] بەردەوام بم لە شەڕ! مرۆڤ هەر هیچ نییە لە چاو هەندێ باڵندە و گیانداری دڕندەدا. گەر بەدەست من بووایە، ئەوا دەمویست ئەو *مارلین*ـە گەورەیە بام، کە لە قووڵایی ئەو زەریا تاریکەدا مەلە دەکا.» دواتر بە دەنگی بەرز گوتی:

- هەڵبەت گەر قرشەکان وەدەر نەکەون، چوون گەر سەروسەکوتیان پەیدا ببێ، ئەوە مەگەر بەس خوا بێ بە فریای هەردووکمانەوە!

---

[1] Un espuela de hueso

[2] جەنگەران: شەڕانی

بیری کردەوە: «تۆ بڵێی دی ماگیۆی مەزن بەقەد من بەرگە بگرێ و بتوانێ لەگەڵ ئەم ماسییەدا هەڵبکا؟ لاریم نییە دەتوانێ و بە زیادیشەوە، چونکە ئەو لە تافی لاوی و ترۆپکی توانای خۆیدایە. جگە لەمەش، باوکی ماسیگر بووە. خۆزگە دەمزانی ئەو دەرپۆقینی ئێسکی پاژنەیەی ئازاری زۆرە یان کەم؟»

بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- من چووزانم، خۆ قەت تووشی نەبووم تا بزانم.

خۆر بەرەو ئاوابوون دەچوو، بۆ ئەوەی ورەی خۆی بەرز بکاتەوە، ئەو ڕۆژەی هێنایەوە یاد خۆی کە لە یەکێک لە گازینۆکانی *کاسابلانکا* یاریی دەستشکاندنەوەی لەگەڵ ڕەشێکی خەڵکی *سیانفۆگوس* کردبوو، کە ئەوکات بەهێزترین و کەڵەگەترین پیاوی بەندەرەکە بوو. شەو و ڕۆژێکی ڕەبەق ئانیشکیان دادابووە سەر ئەو خەتی تەباشیرەی لەسەر مێزەکە کێشرابوو، مەچەکیان ڕێک و ڕاست و پەنجەکانیان توند لە یەکدییەوە ئاڵاندبوون. هەر یەکێکیان لە جێی خۆیەوە هەوڵ و تەقەللای دەدا کە مەچەکی بەرانبەرەکەی بنووشتێنێتەوە و لە ڕووی مێزەکەی بدات. بازاری گرەو گەرم بوو و لەژێر ڕۆشنایی چرا نەوتییەکەدا خەڵکی بە هەڵەداوان خۆیان بە ژووریدا دەکرد و دەهاتنە دەرەوە، ئەمیش لە مەچەک و ڕووخساری ڕەشەکەی دەڕوانی. پاش هەشت کاتژمێری یەکەم، ئەو ناوبژیوانانەی کە بۆ چاودێریی یارییەکە دانرابوون هەموو چوار سەعات جارێک نۆبەتی ئێشکگرتنیان دەگۆڕی، تا کەمێک پشوو بدەن و سەرخەوێک بشکێنن. خوێن زایە ژێر

نینۆکی هەردووکیان، چاویان بڕیبووە چاوی یەکتر و لە مەچەک و باسکی یەکدی ورد دەبوونەوە. گرەوکەرانیش هەر فڕکەفڕکیان بوو، لەسەر کورسییە بەرزەکان پاڵیان بە دیوارەکەوە دەدا و چاودێریی یارییەکەیان دەکرد. دیوارەکان تەختە بوون و بە شینێکی کاڵ بۆیە کرابوون، ڕووناکیی چراکانیش سێبەری دوو یاریزانەکەیان بەسەریانەوە دەنەخشاند. سێبەری ڕەشەکە زل و قلۆر بەدەم گەمەکردنی شنەبا بە گڕی چراکە، بەسەر ڕووی دیوارەکەوە دەهات و دەچوو.

بە درێژایی شەو، سەرکەوتن لەنێوان هەردووکیاندا گەمەی دەکرد و جارێک بەلای ئەمدا دەهات، جارێک بە لای ئەودا. خەڵکەکە برێک لە شەرابیان دا بە زنجییەکە و جگەرەیەکیان بۆ داگیرساند. پاش خواردنەوەی شەرابەکە، هەرچی گوڕوتینی هەبوو خستیە گەڕ و توانیی دەستی پیرەمێردەکە، کە بە دڵنیاییەوە ئەوساکە پیرەمێرد نەبوو، بەڵکو سانتیاگۆی پاڵەوان «el campeon»، سێ ئینچ بنووشتێنێتەوە. وەلێ ئەم زۆرکردن و خۆ گیفکردنەوەیە ئەوەندەی نەخایاند و پیرەمێردەکە دەستی هێنایەوە هەمان ئاستی جارانی. دروست لەو ساتەدا، دەیزانی کە ئەم پیاوە ڕەشە لەشولار بەهێزە دەبەزێنێت.

بەرەبەیان و ئەو دەمەی گرەوکەران داوایان دەکرد کە یارییەکە بە یەکسانی دوایی بێت، ناوبژیوانەکان سەریان بادا و لەپڕ پیرەمێردەکە هەرچی توانایەک لە جەستەیدا هەبوو خستیە گەڕ، بەرەبەرە دەستی ڕەشەی نووشتاندەوە تا سەرئەنجام تەختی سەر مێزەکەی کرد. یارییەکە سەرلەبەیانیی

ڕۆژی یەکشـــەممە دەســـتی پێکـــرد و بەرەبەیـــانی ڕۆژی دووشـــەممە کۆتـــایی هـــات. زۆرێـــک لە گـــرەوکەران داوای یەکسانییان کرد، چونکە دەبوو بچن بەدەم ئیش‌وکاریانەوە، فەردە شەکرەکان بگوازنەوە، یاخود بەرەو *کارگەی خەڵووزی ماڤانا* بکەونە ڕێ. ئەگینا هەمووان حەزیان دەکرد تا دواچرکە بینەری ململانێکە بن، وەلێ هەرچۆنێک بێت پیرەمێردەکە، بەر لەوەی ئەوان بـڵاوەی لـێ بـکەن، یـارییەکەی بە بەرژەوەنـدی خۆی کۆتایی پێ هێنا.

دوابەدوای ڕووداوەکە و پاش ماوەیەکی کەم، خەڵکی نازنـاوی پاڵەوانیـان بەســەر سـانتیاگۆدا بـڕی. بەهـار هـات و یـارییەکی تۆڵەسەندنەوە سازدرا، وەلێ بازاڕی گرەوکردن کەساس بوو، پیرەمێردەکە زۆر بە ئاسانی یارییەکەی بردەوە، چونکە هەر لە ســـــینفیگۆس و لە یەکەم یارییانــــــدا ورەی ڕەشـــــەکەی ڕووخانـدبوو. پـاش ئەمـانە چەنـد یـارییەکی دیکەشـی کـرد و، ئەمجا بە یەکجاری وازی هێنا. دڵنیا بوو کەس شـان لە شـانی نادات و هەر کەسێک ڕووبەڕووی بێتەوە تەختی دەکات، وەلێ دەکرا ئەمە زیـان بە دەسـتی ڕاسـتی بگەیەنێـت و کـاریگەریی لەســەر ڕاوەماســییەکەی دابنێـت. هەوڵـی دا چەنـد یـارییەکی هەڵسەنگێنەرانە بە دەستی چەپی بکـات، بەڵام دەسـتی چەپی هەردەم خیانەتکـار و شـووم بـوو و پیرەمێـردەکەش لێـی ڕانەدەبینی.

بیری کردەوە و گوتی: «ئێستە خۆرەتاوەکە باش‌باش نەرمی دەکـاتەوە، مەگەر سەرماوسۆڵەی شـەو پەکی بخـا، ئەگینـا بێ لەوە نابێ هەرگیز کفت ببێتەوە. خۆزگە دەمزانی، ئەمشـەو چ شتێ چاوەڕێمە؟» ٤

فڕۆکەیەک بەسەر سەریدا بەرەو میامی ڕەد بوو، بینیی کە سێبەرەکەی پۆلێک لە باڵندەماسیی ترساند.

ئینجا گوتی: «بۆی هەیە لەنێو ئەم باڵندەماسیانەدا دۆلفینیش هەبێ.» کەمێک پەتەکەی ڕاکێشا تا بزانێ دەتوانێت بڕێکی هەڵبکاتەوە، وەلێ بێهوودە بوو، هەر کە زانیی خەریکە لە گرژی و لەرزیندا پەتەکە دەپسێ، دەستی لێ هەڵگرت. بەلەمەکە بەکاوەخۆ ڕێی دەکرد و پیرەمێردەکەش چاوی بڕیبووە فڕۆکەکە تاکوو ون بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ڕەنگە سواربوونی فڕۆکە شتێکی ئێجگار سەیروسەمەرە بێ، خۆزگە دەمزانی زەریا لەو ئاسمانە بەرزەوە چۆن دەنوێنێ؟ گومانی تێدا نییە گەر زۆر بەرز نەبنەوە، ماسییەکە دەبینن. ئای چەندە ئاواتەخوازم کە لە بەرزیی سەد بالاوە، بە هێواشی بفڕم و چاو لە ماسییەکەم بکەم. کاتی خۆی کە لە بەلەمی ڕاوکردنی کیسەڵدا کارم دەکرد، دەچوومە سەر ستوونی چارۆکەکە و ڕێک دەوەستام، جا لەو بەرزاییە کەمەشەوە چاوێکم بە زەریادا دەگێڕا و شتانێکی زۆرم دەبینین. لەو بەرزاییەوە دۆلفینەکان زێدە سەوزکار دەچوونەوە، پەڕ و خاڵی ئەرخەوانی و پێکرای ڕەوە ماسییەکانت دەدیت. سەر لەوە دەرناکەم بۆچی ئەو ماسییە تیژڕەوانەی لە چینە تاریکەکاندا مەلە دەکەن پشتیان ئەرخەوانییە، یان پەڕ و خاڵەکانیان؟ دۆلفینەکان بۆیە سەوز دەنوێنن، چونکە خۆیان ڕەنگیان ئاڵتوونییە، وەلێ هەر کە برسییەتی تەنگی پێ هەڵچنی و کەوتە ڕاوکردن، هێڵە ئەرخەوانییەکان وەک مارلینەکان لە لاکانییەوە دەردەکەون. دەبێ چی ئەم هێڵانە دەربخا؟ تووڕەیی یاخود تیژڕەوی؟»

پێش ئەوەی دونیا تەواو تاریک دابێت، کاتێ بەسەر تەوژمە ئاوەکاندا دوورگەیەک لە گژوگیای سارگاسی هەڵتۆقیوی تەی دەکرد، دەتگوت هەر بە ڕاستی ئۆقیانووس کەوتووەتە سەرەتاتکێی دڵداریی و ئەوین لەژێر پەردەیەکی زەردا. دۆلفینێک قولاپی پەتە کورتەکەی دواوەی قوت دا و هەر کە لە ئاوەکە دەرپەڕی، بینیی کە لە بەرتیشکی خۆرە نیوەگیانەکەدا، ڕەنگی هەروەک زێڕ دەبریسکایەوە و لە هەوادا ئەمدیو و ئەودیوی دەکرد. لە ترساندا جار دوای جار هەڵدەبەزی و خۆی دەکێشایەوە بە ڕووی ئاوەکەدا. پیرەمێرد بەرەو پشتەوەی بەلەمەکە ڕۆیشت و چۆکی دادا، جا بە دەستی ڕاستی توند پەتە ئەستوورەکەی گرت و بە دەستی چەپی ڕایکێشا و پەتە هەڵکراوەکەی زووزوو لەژێر پێی خاوسی چەپیدا مت دەکرد. لە ئەنجامدا کێشی کردە ناو بەلەمەکەوە و ماسییەکەش لە ترساندا کەوتە هەڵبڵۆقین، پیرەمێردەکە نووشتایەوە و ماسییە ئاڵتوونییە خاڵخاڵە ئەرخەوانییەکەی هەڵگرت و خستییە سەر تەختەی دواوەی بەلەمەکە. لەتاو ئازاری قولاپەکەی پەیتاپەیتا دەمی دادەڕی و ویکی دەهێنایەوە. تەنگەتاو و خێرا جەستە درێژکۆلەکەی و کلکی و سەری بە بەلەمەکەدا دەدا، تاکوو پیرەمێردەکە کوتەکێکی سرەواندە سەرە ئاڵتوونییەکەی، کەمێک هەڵفرتا و جا جوولەی لێ براو و خپ بوو.

پیرەمێرد قولاپەکەی لە دەمی ماسییەکە دەرهێنا و دووبارە چەشەی ماسیی سەردینی پێوە کردەوە و هاویشتیە نێو زەریا. دواتر بەکاوەخۆ بەرەو پێشکۆی بەلەمەکە ڕۆیشت، دەستی چەپی شووشت و بە پانتۆلەکەی سڕیی. پەتە بارگرانەکەی لە

دەستی ڕاستییەوە گواستەوە دەستی چەپی و بەدەم شووشتنی دەستی ڕاستییەوە لە خۆری دەمەوئاوابوونی نێو ئۆقیانووس ورد بووەوە و سەرنجێکی پەتە درێژبووەکەی دا. پاشان گوتی:

- هیچ نەگۆڕاوە و هەروەک خۆیەتی.

بە وردبوونەوە لە تێپەڕینی ئاوی زەریا بەنێو پەنجەکانیدا، تێبینی کرد کە بە شێوەیەکی بەرچاو بەلەمەکە خاو بووەتەوە. گوتی: «دڵم پێم دەڵێ: سەوڵەکان بەیەکەوە گرێ بدەم و لە دواوەی بەلەمەکەیان گیر بکەم، بەم جۆرە خێرایی ماسییەکە بە شەودا خاو دەکەمەوە. وا بزانم بەنیازە، ئەمشەویش ڕۆژمان لێ بکاتەوە، منیش کێشەیەکم نییە!»

بیری کردەوە: «وا باشترە دۆلفینەکە لەتلەت بکەم، بۆ ئەوەی خوێن لە گۆشتەکەیدا بمێنێتەوە. کەمێکی دی هەر کە سەوڵەکانم بەیەکەوە گرێدان، ئەویش لەت دەکەم. دەڵێم باشتر نییە لەم کاتی خۆرئاوابوونەدا سەرشاخی ماسییەکە نەگرم و هەروا بە بێدەنگیی وازی لێ بهێنم، چونکە خۆرئاوابوون کاتێکی دژوارە بۆ گشت ماسییەکان.»

دەستی بڵند کرد تاکوو لە هەوادا وشک ببێتەوە، جا پەتەکەی تێوە ئاڵاند و نووشتایەوە بەسەر بەلەمەکەدا و هێندەی پێی کرا هەلی بۆ لەشە شەکەتەکەی ڕەخساند و ڕێگەی دا بەرەو تەختەی پێشکۆی بەلەمەکە کێش بکرێت، بەم جۆرەش بەلەمەکە بارێکی قورستری دەکەوتە سەر. لە بەرخۆیەوە گوتی: «نا نا، وردەوردە خەریکە فێری کارەکە دەبم، هیچ نەبێ بەشێکی. ئەوەشم بیر نەچێ لەوەتەی بە قولاپەوە بووە، دەمی

لە هـیچەوە نەداوە، ئەمە سـەرەڕای ئەوەی کە ماسـییەکی گەورەیە و پێویسـتی بە بڕێکـی زۆر لە خـۆراک هەیە. مـن ماسـییەکی تـونەم بە تەواوی خـوارد، سـبەی دۆلفینـەکەش دەخۆم.» پیرەمێرد بە دۆلفینی دەگوت *دۆرادۆ*. جا بەردەوامی دایێ: «ڕەنگە باشتر بێ، پاش ئەوەی هەڵم دڕی هەندێکی لێ بخۆم. دەزانـم کە جـوین و خـواردنی لە تـونەکە ناخۆشـترە، وەلێ چارم ناچارە». بە دەنگێکی بەرز لە ماسییەکەی پرسی:

- ماسییەکە چۆنی؟ من زۆر باشم و دەستی چەپیشم ئێستە باشـترە. بەشـی ئەمـڕۆ و سـبەینێش خـۆراکم پێیە. بەلەمەکە ڕاکێشە ئەی ماسی، دەی ڕایکێشە!

ئەوەی ڕاستی بێت ئەوەندە لە بارێکی باشدا نەبوو کە خۆی بانگەشەی بۆ دەکرد، چون ئازاری پەتەکەی پشتی گەیشتبووە ترۆپک و لەوەدابوو لە پەلوپۆی بخات و هەر ئەمەش بووبووە مایەی ترس و نیگەرانیی. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ڕۆژگەلی زۆر لەمە سەختتر و دژوارترم دیتون، دەستی ڕاستم بە سووکی برینـدارە و دەسـتەکەی تریشـم کفتبـوونەکەی نەمـاوە. لە هەمـووی گرنگتر قاچەکانم هیچ زیانێکیان بەر نەکەوتووە و سـاغن. بـا ئەوەش لەولاوە بووەسـتێ کە بە تەواوی جڵەویم گرتووە و لە هەموو خۆراکێکم دوور خستووەتەوە.»

تاریکی باڵی بەسەر گەردووندا کێشا، لە مانگی ئەیلولدا شەو زووتر دادێت. پاڵی دا بە پێشکۆی بەلەمەکەوە و تا بۆی کرا، حەسـایەوە. ئەسـتێرە پێشـەنگەکان بە ئاسـمانەوە دەرکەوتـن، ناوی ڕیگڵی نەدەزانی، وەلێ دیتبووی و دەیزانی کەمێکی دی

گشت هاوڕێ دوورەکانی تریشی هەڵدێن و بە ئاسماندا بڵاو دەبنەوە. بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- خۆ ماسییەکەش هاوڕێمە. هەرگیز لەوەوپێش نە ماسییەکی وام دیتبوو، نە لە دەمی یەکێکەوە بیستبووم باس بکرێ، وەلێ هەر دەبێ بیکوژم. زۆر شادم کە ناچار نین ئەستێرەکان بکوژین!

لە بەرخۆیەوە گوتی: «بیهێنە پێشچاوی خۆت گەر مرۆڤ ناچار بووایە هەموو ڕۆژێ بچێ مانگ بکوژێ! گومانی تێدا نییە مانگ دەمودەست ڕای دەکرد، وەلێ ئەی ئەگەر ناچار بووایە بچێ خۆر بکوژێ؟ بە ڕاستی ئێمە بوونەوەرگەلێکی بەبەختین.» هەر کە زانیی ماسییەکە هیچ شتێکی نییە بیخوات، بارێکی خەم و بەزەییپێداهاتنەوە دایگرت، وەلێ ئەم جەرگسووتان و غەمە ڕێگر نەبوو لە کوشتنی. بیری کردەوە: «تۆ بڵێی ئەم ماسییە زگی چەند کەس تێر بکا؟ پرسیارەکە ئەوەیە کە ئەسڵەن ئەو خەڵکە شیاوی ئەوەن گۆشتەکەی بخۆن؟ نەخێر، بێ گومان نەخێر. کەس شیاوی خواردنی ئەم ماسییە نییە پاش ئەو هەموو نەبەردی و جوامێرییەی.»

لە دڵی خۆیدا گوتی: «من سەر لەم شتانە دەرناکەم، ئەوەندە دەزانم کە زۆر خۆشبەختین کە ناچار نین دووی خۆر و مانگ و ئەستێرەکان بکەوین. بەشی ئێمە هەر ئەمەیە، کە لەناو زەریادا برا ڕاستەقینەکانی خۆمان بکوژین. لە ئێستادا دەبێ بیر لە ڕێگەچارەیەک بکەمەوە تا بەلەمەکەی پێ خاو بکەمەوە. ئەمەش لە خۆیدا لایەنی باش و خراپی هەیە. چونکە گەر سەوڵەکان گیر بکەم ئەوا بڕێکی زۆر پەتم لە کیس دەچێ. خۆ

ئەگەریش بە هەموو گوڕوتینیەوە مل بنێ و بەلەمەکە کێش بکا ئەوا ئەگەری هەیە لەدەستی بدەم. خاوکردنەوەی بەلەمەکە لە ئازارەکانی من و ئەویش کەم دەکاتەوە و زامنی سەلامەتیمە، چونکە هێشتا ماسییەکە بە تەواوی گوڕی نەداوەتە بەر خۆی. بەهەرحاڵ پێویستە دۆلفینەکە هەڵدڕم نەکا بگەنێ و بۆن بکا، ئەوجا شتێکیشی لێ بخۆم تا بە بەهێزی بمێنمەوە.»

«هەنووکە با کاتژمێرێکی تریش پشوو بدەم، جا لە ڕێچکە و خێرایی ماسییەکە دڵنیا دەبمەوە، بەر لەوەی بچمە دواوەی بەلەمەکە و بڕیار بدەم. لەم سەروبەندەدا دەتوانم ئاگاداری ڕێڕەو و هەموو ئەو گۆڕانکاریانە بم کە ڕوو دەدەن. بیرۆکەی سەوڵەکان فێڵێکی چاکە، وەلێ ئێستە پێویستە بە وریاییەوە لە خەمی سەلامەتیی خۆمدا بمێنمەوە! چونکە ئەم مارلینە گەلێ بەهێز و خۆڕاگرە. قولاپەکەم لە سووچێکی دەمیدا بینی، کە توند دانی لێ گیر کردبوو و دەمی قەپات کردبوو، وەلێ ئازاری قولاپ لە چاو برسییەتی و ڕووبەڕووبوونەوەی شتێک کە تێی ناگەی، هەر هیچ نییە. پیرەمێرد! وازی لێ بێنە خەریکی کاری خۆی بێ، تا نۆرەی تۆش دێ.»

کەم تا زۆر بۆ ماوەی دوو کاتژمێرێک، کە خۆی پێی وابوو ئەوەندەیە! پشووی دا. مانگ تا درەنگانی شەو دەر نەدەکەوت و ئەمیش هیچ ڕێگایەکی تری شک نەدەبرد تا کاتی پێ بزانێت. دوای ئەوەش ئەم پشووە تەنها حەسانەوەیەکی کورت و ڕێژەیی بوو و تاکوو ئەم ساتەش هەر باری گرانی پەتەکەی بەسەر شانەوە بوو. دەستی ڕاستی گرت بە پێشکۆی بەلەمەکەوە و بەم جۆرە بەشێکی زۆری ئەرکی کێشکردن و بەرپەرچدانەوەکەی خستبووە ئەستۆی بەلەمەکە. بیری

کردەوە: «چەندە باش دەبوو گەر شتێ پەتەکەم ڕاکێشـایە، وەلێ ئەوکات ماسییەکە بە ڕاتەکاندنێ دەیقرتاند. پێویستە لە ڕێی جەستەمەوە هێزی ڕاکێشانەکەی کەم بکەمەوە و هەرکاتێکیش پێویستی کرد ئەوا بە هەردوو دەست پەتی بۆ شل بکەم.»

بە دەنگی بەرز گوتی:

- وەلێ هیچ نەنووستووی پیرەمێرد. ئەوە شەو و ڕۆژێکە تۆزقاڵێک خەو چییە نەچووەتە چاوانتەوە و، وا خەریکە ڕۆژێکی دیکەشی بە دوادا دێ و چاوەکانت بۆ ساتێک لێک نەناون! مادام ماسییەکە لەسەرخۆیە، پێویستە ڕێگەچارەیەک بدۆزیتەوە تا سەرخەوێ بشکێنی. چونکە گەر کەمێ نەنووی، ئەوا بیرت پەرت دەبێ و مێشکت بە سافی نامێنێتەوە.

بیری کردەوە: «مێشکم سافە و زۆریش نەک کەم، هەروەک سافی و درەوشاوەیی برا ئەستێرەکانم. وێڕای ئەمەش، هەر دەبێ کەمێ بخەوم، چونکە ئەستێرەکان و مانگ و خۆریش دەخەون. تەنانەت ئۆقیانووسیش هەندێ کات دەخەوێ، ئەو دەمەی هیچ تەوژمێ نییە و بێدەنگی و مەنگی باڵی بەسەر ڕووی ئاوەکەیدا کێشاوە.»

هەمدیس بیری کردەوە: «بیرت نەچێ پێویستە کەمێ بخەوی هـا! هەرچیت کـردووە، ڕێگەیەکـی سەلامەت و بێکێشە بدۆزەرەوە تا چارەی ئەم پەتەی پێ بکەی. جا دەستوبردێک بکە و بجۆرە دواوە دۆلفینەکەت ئامادە بکە. بیرۆکەیەکی باش نییە سەوڵەکان ببەستی و خۆشت بێخەمانە لێی بخەوی.» جا

لە بەرخۆیەوە گوتی: «دەتوانم بەسەر خەوەکەمدا زاڵ ببم، وەلێ کارێکی پڕمەترسییە.»

دەستی دادا و لەسەر ئەژنۆ ڕووەو دواوەی بەلەمەکە کەوتە ڕێ، بێ ئەوەی بە هیچ لۆنێک پەتەکە ڕابکێشێت. لە دڵی خۆیدا گوتی: «دەشێ ماسییەکەش نیوە نووستوویەک بێ، وەلێ من دەمەوێ شەکەتی ئەوکی[1] بگرێ و نەخەوێ و تا سەرەمەرگ ئەو پەتە ڕابکێشێ!»

هەر کە گەیشتە دواوەی بەلەمەکە، ئاوڕی دایەوە و پەتەکەی بە دەستی چەپی گرت، جا بە دەستی ڕاستیشی چەقۆکەی لە کیفەکەی دەرکێشا. لەژێر ڕۆشنایی ئەستێرە درەوشاوەکاندا بە ڕوونی دۆلفینەکەی دەدیت. نووکی چەقۆکەی چەقاندە سەری و ڕایکێشایە بەردەم خۆی، جا قاچێکی خستە سەری و هێواش‌هێواش لە سکییەوە تا چەناگە هەڵی دڕی، دواتر چەقۆکەی دانا و بە دەستی ڕاستی ناوسکی دۆلفینەکەی دەرهێنا و بە تەواوی خاوێن و ئامادەی خواردنی کرد. گەدەی دۆلفینەکە لەناو دەستیدا لیق و خلیسک بوو، هەڵی دڕی و بینیی دوو باڵندەماسی تازەی گۆشتنی تێدایە، لە پەنای یەکەوە خستنییە لایەکەوە و پاشەڕۆکەی تووڕدایە زەریا و بە شوێن خۆیدا و بەسەر ڕووی ئاوەکەوە هێڵێکی فۆسفۆریی جێ هێشت. دۆلفینەکە ساردوسڕ بوو و، لەژێر ڕۆشنایی ئەستێرە گەشەکاندا زەردباو دەینواند. پێی ڕاستی نایە سەر سەری و پێستەی لایەکی داماڵی، پاشان هەڵی گێڕایەوە و لایەکەی

[1] ئەوک: قورگ؛ بینەقاقا؛ بین.

دیکەشی داماڵی و لە سەریەوە تا کلکی هەرچی گۆشتی پێوە بوو گرتییەوە.

ئێسکەپەیکەرەکەی هاویشتە زەریا و ورد بووەوە تا بزانێت داخۆ هیچ گێژەنێک لە ئاوەکەدا هەیە، کەچی بێ لە ڕۆچوونێکی مێواشی ڕووناک هیچی دیکەی بەدی نەکرد. لای کردەوە و دوو باڵندەماسییەکەی خستنە تەک ئەو لەتە گۆشتانەی کە بە دۆلفینەکەوە گرتبوونیەوە، پاشان چەقۆکەی خستەوە کیفەکەی و گەڕایەوە پێشکۆی بەلەمەکە. بە دەستی ڕاستی دۆلفینەکەی هەڵگرتبوو و لەژێر گوشار و قورسایی پەتەکەدا، پشتی پیرەمێردەکە کووڕ بووبوو.

هەر کە گەیشتە پێشکۆی بەلەمەکە پارچە گۆشتەکەی بەسەر تەختەکەدا دا و دوو باڵندەماسییەکەشی لە پەنایەوە دانان. جا پاڵی بە تەختەکەوە دا و پەتەکەی گواستەوە لایەکی تری سەر شانی و بە دەستی چەپ توند گرتی. بەسەر لایەکی بەلەمەکەدا چەمییەوە و دوو باڵندەماسییەکەی پاک لە ئاوەکەدا شووشت، هاوکات بۆ ئەوەی مەزەندەی خێرایی ئاوەکەش بکات. دەستی چونکە پێستەی دۆلفینەکەی پێ داماڵیبوو، بە چەشنی فۆسفۆر دەبریسکایەوە و، سەرنجێکی ڕێکردنی ئاوەکەی بەناو پەنجەکانیدا دا.

زەریا کەمتر هەڵچووبوو و ماتیی پێوە دیار بوو، لەپێ دەستی بە تەختەی بەلەمەکە سڕی و بڕێک وردە فۆسفۆری پێوە هەڵوەری، پاشان بەکاوەخۆ بەرەو دواوەی بەلەمەکە کەوتە ڕێ. گوتی:

- یا ئەوەتا زۆر شەکەتە، یا دەحەسێتەوە. ئێستە با دۆلفینەکە بخۆم، کەمێ ماندوویەتیی جەستەم دەر بکەم و سەرخەوێکی بۆ بشکێنم.

لەژێر ئاسمانی مێخکوتکراو بە ئەستێرە و تاریکیی نووتەکی شەودا، تا دەهات هەوا ساردتر دەبوو. نیوەی پارچەگۆشتێکی دۆلفینەکە و یەکێک لە باڵندەماسییەکانی خوارد، پاش ئەوەی ناو سکی دەرهێنابوو و سەری لێکردبووەوە. پاشان گوتی:

- بیر بکەرەوە دەبێ چەند بەلەزەت دەرچێ، گەر دۆلفین بکوڵێنری! چەندە بێتام و خاویشە بە کاڵی! لەمەودوا دووپێ ناخەمە بەلەمەوە تا کەمێ خوێ و لیمۆ لەگەڵ خۆمدا نەهێنم.

بیری کردەوە: «گەر تۆزقاڵێ مێشک لە سەرمدا هەبووایە هەڵبەت بە درێژایی ڕۆژ ئاوم بە پێشکۆی بەلەمەکەدا دەکرد، تا وشک بێتەوە و شتێ خوێم دەستکەوێ. وەلێ ئەوکات نەمدەتوانی دۆلفینەکە ڕاو بکەم تا کاتی خۆرئاوابوون. بەهەرحاڵ، ئەمە نیشانەی کەمتەرخەمیی منە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو گۆشتەکەم جوویی و دڵیشم تێک هەڵنەهات.»

پەڵە هەورەکان ئاسمانی ڕۆژهەڵاتیان تەنیی، هەموو ئەو ئەستێرانەیان پەردەپۆش کردن کە پیرەمێردەکە یەک بە یەک دەیناسین. لەو ساتەدا هەستی کرد بە دۆڵێکی قووڵی هەوریندا گوزەر دەکات و، بایەکەشی بە تەواوی خستبوو. پیرەمێردەکە گوتی:

- دوو سێ ڕۆژی تر، کەشوهەوا تێک دەچێ، وەلێ بۆ ئەمشەو و سبەیش باش دەبێ. ئێستە تا ماسییەکە لەسەرخۆ و هێمنە، هەوڵ بدە کەمێ بخەوی پرەمێرد.

توند بە دەستە ڕاستی پەتەکەی گرت، هەموو قورسایی لەشی خستە سەر پیشکۆی بەلەمەکە و ڕانی توند خستە سەر دەستی ڕاستی، پاشان پەتەکەی لەسەر شانی کەمێک هێنایە خوارێ و لەژێر دەستی چەپیدا متی کرد. بەدەم بیرکردنەوەوە گوتی: «مادام پەتەکە بەو جۆرە توند کراوە، دەستی ڕاستم توانای جڵەوگرتنی هەیە. خۆ گەر ئەو کاتەش کە لە گەرمەی خەودام کتوپڕ جوولەیەک بکا، ئەوا یەکسەری دەستی چەپم بەئاگام دێنێ. دڵنیام ئەمە بارێکی گران دەبێ لەسەر دەستی ڕاستم، وەلێ کێشە نییە، چونکە لەمێژە بە ئازار و مەینەت ڕاهاتووە. تەنانەت گەر نیو کاتژمێر یان بیست خوولەکێکیش بخەوم، هەر خراپ نییە.» بەرەو پێش چەمییەوە و جەستەی خۆی گرمۆڵە کرد تا بەرهەڵستیی قورسایی پەتەکەی پێ بکات، هەموو کێشی لەشی بەسەر دەستی ڕاستیدا دابوو. پاشان خەوی لێ کەوت.

ئەم جارە هیچ شێرێکی لە خەونیدا نەبینی، بەڵکو ڕەوە بەرازێکی زەریایی گەورەی بینی کە درێژییەکەی هەشت بۆ دە میل دەبوو. لە وەرزی زاوزێدا بوون و بەرەو ئاسمان دەردەپەڕین یەکسەری خۆیان دەکردەوە بە هەمان ئەو کەلێنە ئاوەدا کە لێوەی دەرپەڕیبوون. بینیی لەسەر تەختەخەوەکەی لە لادێ ڕاکشاوە و بای ژووروو هەڵی کردبوو و لە سەرمادا وەک بێ هەڵدەلەرزی. دەستی ڕاستی سڕ بووبوو و مێروولەی دەکرد، چونکە لەجێی بالیف خستبوویە ژێر سەری.

پاشان کەنارێکی درێژەوەبووی زەرد و سەرگەلەی شێرەکانی بینی کە لە بەرەبەیاندا بەرەو ڕۆخ دادەگەڕا و هەموو ئەوانەی دیکەش شوێنی دەکەوتن. لە خەوەکەیدا پیرەمێرد چەناگەی

خســـتبووە ســــەر لێـــواری بەلەمەکە و لە بیرکــــردنەوەدا ڕۆچووبــوو. کەشــتییەکەی لەنــگەری گــرت و ســروەی فێنکــی دەمەوئێواران هەڵی کرد. تەواو کەیفخۆش بوو و چاوەڕوانیی دەکرد تـا بزانـێ شێری دیکەش بەدوایاندا دێن یان نـا. مانـگ دەمێک بـوو هەڵهاتبوو و بە ئاسمانەوە دەدرەوشایەوە، وەلـێ پیرەمێردەکە پرخەی خەوێکی قووڵی لێدابوو و ماسییەکەش خاوخلیچکـانە کێشـی دەکـرد. بەلەمەکەش لە تەموتواڵیـدا ملـی ڕێی گرتبوو.

لەپڕ دەستی ڕاستی ڕاتەکی و زرمەی لە دەموچاوی هەستاند، پەتەکە خراپ دەستی ڕاستیی سووتاندەوە و دەستی چەپیشی تەواو سڕ بووبـوو و نەدەجولا. تـا توانیی بە دەسـتی ڕاسـت پەتەکەی ڕاکێشـا، وەلـێ پەتەکە لە دەسـتی بەر بـوو. دەسـتی چەپـی خێـرا فریـای کەوت و گــرتیەوە، جـا بەرەو دوا وەرچەرخی و پەتەکە بەردەوام پشت و دەستی چەپی لە یەک کاتدا دادەبڕی. هەموو قورساییەکە کەوتبووە سەر دەستی چەپی و پەتەکەش بێڕەحمانە دایدەبڕی. پیرەمێردەکە ئاوڕی دایەوە تا تەماشایەکی گلۆلە پەتەکان بکات، بینیی بەرەبەرە وا دەکــرێنەوە. هەر لەو ســاتەدا مــارلین بە شــڵپەیەک ڕووی زەریای هەژاند و دەرپەڕی و بە هەموو قورسایی و کەتەیی لەشییەوە خۆی بەنێو ئاوەکەدا کردەوە. هێندەی پێنەچوو کەوتەوە بـازرەقە بەسـتنی[1] یەک لەدوای یەک. وێـڕای ئەو هەموو پەتەش کە بۆی شل کردبوو، کەچی بەلەمەکەی تیژ دەئـاژووت. ئەمە بـا کێشـکردنی پیرەمێـردەکەش لەمـلاوە بوەستێت، ئەوەنـدە توونـد گرتبـووی لەوەدابـوو بقرتێت. لە

[1] بازرەقەبەستن: دەرچوونی گیاندار خێرا و بەپرتاو.

دوابەدوای ئەم کێشمەکێش و ململانێیەدا، ماسییە زل و کەتەکە پیرەمێردی بە دەمدا خست و لووتی چەقییە گۆشتی دۆلفینەکە.

بەدەم بیرکردنەوەوە گوتی: «پێویست بە گلەیی و بۆڵەبۆڵ ناکا، باش دەمزانی کە ئەمەی لێ دەکەوێتەوە.» دواتر لە بەرخۆیەوە گوتی: «کارێکی پێ بکە باجی هەموو ئەمانە بدا، تۆڵەی هەمووی لێ بستێنەوە!»

لە کاتی دەرپەڕینەکانیدا نەیدەتوانی ببینێت، تەنها گوێی لە هاشوهووشی هەژینی ئاوەکە و داکشانەوەی بوو. پەتەکەش خێرا و یەکبینە دەستی دادەبڕی و دەیسووتاندەوە. هەوڵی دا شوێنە ساغەکانی دەستی بەکار بهێنێت و نەیدەهێشت پەتەکە بەر لەپی دەستی بکەوێ یان پەنجەکانی دابڕێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: «گەر کوڕەکە لێرە بووایە پەتەکەی تەڕ دەکرد. بەڵێ، گەر کوڕەکە لێرە بووایە، گەر لێرە بووایە!»

پەتەکە هەر دەکشا و دەکشا، وەلێ وردەوردە هێواش دەبووەوە و پیرەمێرد ماسییەکەی ناچار کردبوو کە باجی هەر ئینجێکی پەتەکە بدات. لە پێشکۆی بەلەمەکە سەری هەڵبڕی و توێژاڵی ئەو گۆشتەی سڕی کە بە دەموچاویەوە نووسابوو، جا کەوتە سەر ئەژنۆ و بە هێمنی هەستایەوە سەر پێ. بەردەوام پەتەکەی بەرەلا دەکرد، وەلێ بە شێوەیەکی خاوتر. تا قاچی نەخستە سەر، گلۆلە پەتەکانی نەبینین. زانیی هێشتاکە بڕێکی باش پەتی زیادەی ماوە، ئێستە لەسەر ماسییەکەیە کە باری گرانی یەک بە یەکی ئەو پەتانەش هەڵبگرێت.

لە بەرخۆیەوە گوتی: «بەڵێ، ئەوەتا زیاد لە دوانزە جار هەڵبەزی. بێ گومان کیسەکانی پشتی پڕ کردوون لە هەوا و

بەم جــۆرەش نـــاتوانێ بەرەو قـــووڵایی داگەڕێ و لەوێ بە دەردی خۆیەوە بمرێ، بە جۆرێ کە من نەتوانم بیهێنمە دەر. بێ گومـان بەم نزیکانە دەکەوێتە خولخـواردن. ئەوسـا کـاری ڕاستەقینەی مـن دەسـت پێ دەکـات و پەلکێشـی ئەو شـوێنەی دەکەم کە مەبەستمە. داخۆ چ شتێ وای لێ کردبێ ئـاوا کتوپڕ دەمری ببێ و ڕاپەڕێ؟ تۆ بڵێی برسییەتی زۆری بۆ هێنـابێ و نائومێدیی خستبێتە دڵیەوە؟ یان شتێ لە تاریکیدا تۆقاندبێتی؟ دەشێ لەپڕ ترسـابێ. نـازانم، پێشـتر زۆر هێمن و لەسـەرخۆ و چـاونەترس بـوو. سـەیرە!.» دواتـر گـوتی: «باشـتر وایە ئەی پیرەپیاو تۆش بوێر بی و لە خۆت ڕاببینی. دووبارە جڵەویت گـرتەوە بەس حەیفـێ کە نـاتوانێ ئەو پەتەی لە کیسـت چـوو بیهێنیتەوە، وەلێ هێندەی پێناچێ دەکەوێتە خولخواردن.»

پیرەمێـردەکە بە دەسـتی چەپ و شـانەکانی جڵـەوی پەتەکەی گرتبـوو. دانەوێ و مشـتێک ئـاوی بە دەموچاویـدا کـرد، تـا گۆشـتی دۆلفینەکە لـێ بکاتەوە. هەر خەمـی ئەوەی بـوو بۆنی گۆشـتەکە دڵـی تێـک هەڵهێنێت و بڕشـێتەوە، چـونکە ئەوکـات تەواوی وزە و گـوڕوتینی جەسـتەی لەدەسـت دەدات. کاتێـک دەموچـاوی پـاک بووەوە، دەسـتی ڕاسـتی لە ئـاوە سـوێرەکەدا شووشت و قەیرێک لەنێویدا هێشتیەوە و چاوی بڕییە یەکەمین دەزوولە ڕوونـاکیی بەر لە گزنـگ. بیـری کـردەوە و گـوتی: «ئێستاکە ڕووی کردووەتە ڕۆژهەڵات. ئەمەش مانـای وایە کە هـیلاک بـووە و خـۆی بەدەم شـەپۆلەکانەوە داوە. ئەوەندەشـی پێناچێ دەست دەکا بە سووڕانەوە و، ئەودەم کاری من دەست پێـدەکا.» پـاش ئەوەی وەک پێویسـت دەسـتی لەنـاو ئـاوەکە هێشتبووەوە، دەری هێنا و تەماشایەکی کرد و گوتی:

- نا نا، خراپ نییە. پیاو پیاو بێ، نابێ گوێی لە ئێش و ئازار بێ.

بە پارێزەوە پەتەکەی گرت، نەوەک بە یەکێک لە برینە تازەکانی دەستیدا بخشێت، جا خۆی وەرچەرخاند تا بتوانێت لە لایەکی بەلەمەکەوە دەستی چەپیشی کەمێ لە ئاوەکە وەر بدات. ڕووی قسەکانیی کردنە دەستی چەپی و گوتی:

- نەکا پێت وابێ لەخۆڕا ئەم هەموو بەلایەت بەسەردا هاتووە! وەلێ بۆ ساتێک لێم بزر بووی و نەمتوانی بتدۆزمەوە!

بیری کردەوە: «ئاخر بڵێ خوایە بۆ منیش بە دوو دەستی تۆکمە و بەهێزەوە لە دایک نەبووم؟ ڕەنگە هەمووی سووچی خۆم بێ، چونکە بە پێی پێویست مەشقم بەو دەستەم نەکرد، وەلێ خوا خۆی ئاگادارە بەشی ئەوە دەرفەتی بۆ ڕەخسا تا خۆی تۆکمە بکا. هەرچۆنێ بێ، خوا هەڵناگرێ ئەمشەو کاری باشی ڕاپەڕاند، تەنها جارێکیش کفت بوو. خۆ گەر دووبارەی بکاتەوە، ئەوا وازی لێ دەهێنم پەتەکە جوانجوان دایبڕێ و خەڵتانی خوێنی بکا.»

کاتێ ئەمەی بە بیردا هات، زانیی کە مێشکی ساف نەبووە و پێویستە بڕێکی تر لە گۆشتی دۆلفینەکە بخوات.

- وەلێ چی بکەم، پێم ناخورێ! هەرچۆنێ بێ سەرەخولێ و گێژکەوتن زۆر لەوە باشترە هەرچی وزەی جەستەت هەیە بە ڕشانەوە بڕوا. وەک چۆن دەشزانم پاش ئەوەی بە دەموچاومدا پلیشایەوە پێم ناخووری. هەر بۆیە هەڵی دەگرم بۆ حاڵەتێکی کتوپڕانە، تا ئەوکاتەی بۆگەن دەکا، وەلێ کار لە کار ترازاوە، تازە ناتوانم بە خواردن قەرەبووی ئەو هەموو

وزە لەکیسچووەم بکەمەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «تۆ گەمژەی، باڵندەماسییەکی تر بخۆ.»

پاک و ئامادە لەوێ دانرابوو، بە دەستی چەپی هەڵی گرت و بە پارێزەوە ئێسکەکانی کرۆشتن، جا لە سەرییەوە بۆ کلکی پێیدا هاتە خوار و هەمووی لرف دا. لە بیرکردنەوە ڕۆچووەوە: «لە هەموو ماسییەکانی دی وزەی زیاتری تێدایە، هیچ نەبێ بەشی ئەوەی تیدایە کە من پێویستمە. ئەوەی لەدەستم هات کردم، ئیدی با ئەویش دەست بە خولخواردنەکەی خۆی بکا و مەیدانی بەربەرەکانێکە گەرم ببێ.»

ئەو دەمەی مارلینەکە دەستی بە خولانەوە کرد، بۆ جاری سێیەم خۆر بەسەر پیرەمێرد و بەلەمەکەیدا هەڵهات. هێشتاکە زوو بوو بۆ خولخواردن، پیرەمێردیش تەنها هەستی بە لادان و ڕاکێشانێکی هێواش کرد و بە هێواشی کەوتە ڕاکێشانی پەتەکە. وەک هەمیشە پەتەکە قورس بوو، وەلێ هەر کە دەگەیشتە خاڵی پچڕان ئیدی دەستی بۆ شل دەکرد. پیرەمێرد پەتەکەی بەسەر شان و سەریدا داگرت و بە هەردوو دەستی تا توانیی کەوتە ڕاکێشانی، لەم نیوەندەدا هەوڵی دا زۆربەی هەرە زۆری فشارەکە بەر جەستەی و قاچەکانی بکەوێت. بەدەم ڕاکێشان و زۆرکردنەوە، قاچ و شانە پیرەکانی پیرەمێردەکە بەملا و بەولادا دەکەوتن و دەلەرزین. پاشان گوتی: «خەریکی خولخواردنە، وەلێ خولێکی دووردرێژە.»

لەوەدابوو پەتەکە بە دەستیدا فرتە بکات و بەر ببێت، وەلێ پیرەمێرد بە چاکی دەستی لێ توند کربوو و جەڕی دابوو، لە بەررووناکیی خۆرەکەدا چەند تنۆکە ئاوێکی بینی کە پێیدا

پڕان. پەتەکە بەناو ئاوەکەدا فرکەی کرد و پیرەمێردەکە لە داخان بە چۆکدا هات و وازی لێ هێنا بەناو تاریکستانی ئاوەکەدا نووقم بێت و گوتی:

- هەنووکە لە گەرمەی خولخواردنەکانیدایە.

پاشان بیری کردەوە: «پێویستە توند پەتەکە بگرم، چونکە هەر ڕاکێشان و زۆرکردنی بازنەی خولخواردنەکەی کورتتر دەکاتەوە. بەم جۆرەش ئەگەری هەیە پاش کاتژمێرێکی دیکە چاوم پێی بکەوێ. ئێستە پێویستە بە سەریدا زاڵ بم، ئینجا بیکوژم.»

بەڵام ماسییەکە بەردەوام لەسەرخۆ و هێواش خوولی دەخوارد و دوو کاتژمێر دواتریش لەشی پیرەمێردەکە چینچین ئارەقەی لێوە دەتکا و شەکەتی گەیشتبووە مۆخی ئێسکەکانی. وەلێ سوورەکانی ماسییەکە تا دەهات کورتتر دەبوونەوە، بە لەرزینی پەتەکەدا پیرەمێردەکە تێگەیشت کە بەرەبەرە ماسییەکە خەریکە سەرئاو دەکەوێت و لە ئاستێکی کەمتر قووڵدا مەلە دەکات.

یەک کاتژمێری تەواو پیرەمێردەکە چاوی ڕەشکەوپێشکەی کرد. چۆڕەی ئارەقەی سوێر کە دەری دەدا برینەکەی خوار چاو و تەوێڵی دەکزاندنەوە. ملی بەم بەرچاوتاریکبوونە نەدەدا، چونکە لەچاو دەردیسەریی ڕاکێشانی پەتەکەدا، هەر هیچ نەبوو. هەرچۆنێک بێت، دوو جار هەستی بە گێژکەوتن و سەرەگێجە کرد و ئەمەش تەواو بووە جێی سەرنج و نیگەرانیی. جا گوتی:

- ئەمتوانی خۆم ڕسوا بکەم و لەبەرانبەر ماسییەکی وادا چۆک دابدەم و بمرم، وەلێ کە تا ئێرە هێناومە، خوایە گیان تۆش یارمەتییەکم بدە، سەبر و توانای خۆڕاگریم پێ ببەخشە. بەڵێن بێ سەد کەڕەت هەردوو ویردی *باوەڵێمان* و *درووود* بۆ تۆ مریەم بخوێنم. وەلێ ئێستاکە ناتوانم!

بیری کردەوە: «وای دانێ خوێندووتن. خۆ قابیلە چییە، دواتر هەر دەیانخوێنم.» بە هەردوو دەست توند پەتەکەی گرتبوو و کتوپڕ پەتەکە ڕاتەکی، وەلێ چ ڕاتەکینێک! زێدە بەهێز و خێرا.

پیرەمێرد بیری کردەوە: «خەریکە ڕمەکەی قەپۆزی بە بنکەی پەتەکە دەکێشێ، هەر چاوەڕوانیی ئەمەم دەکرد. بێ لەمە، چارەیەکی دیکەی نەبوو، هەر ئەمەش ناچار بە هەڵبەزینی دەکا. بەدەست من بووایە حەزم دەکرد لە خولخواردن نەکەوتایە. بۆ ئەوەی سییەکانی پڕ بکا لە هەوا ناچارە ڕاپەڕێ، وەلێ لەگەڵ هەر تەکانێکدا دەلاقەی برینەکەی دەمی گەورەتر دەبێ و لە ئەنجامیشدا ئەگەری هەیە قولاپەکە بترازێ و سووک و ئاسان قوتاری ببێ.» ئینجا گوتی:

- هەڵمەبەزە ئەی ماسییەکە، هەڵمەبەزە!

چەند جارێکی تریش قەپۆزی بە پەتەکەدا کێشا، لەگەڵ هەر جارێکیشدا پیرەمێردەکە ناچار بڕێ پەتی بۆ شل دەکرد. جا بیری کردەوە: «پێویستە هەروا لە ئازار و ئەشکەنجەدا بیهێڵمەوە. ئازارەکانی خۆم بەرگەگیراو و سووکن، وەلێ ئەوانەی ئەو دەکرێ زۆری بۆ بهێنن و دواجار شێتی بکەن.»

پاش تاوێک ماسییەکە لە پێداکێشانی پەتەکە وەستا و هێمنانە کەوتەوە خولخواردنی خۆی. پیرەمێردەکە بەردەوام پەتەکەی

هەڵدەکردەوە، وەلێ دووبارە هەستی بە گیژکەوتنێکی توند کرد. مشتێک ئاوی بە سەریدا کرد و، جا مشتێکیشی پرژاندە دەموچاوی و دەستێکی بە پشتەملیدا هێنا. ئینجا گوتی:

- ئێستە هیچ جێیەکم گرژ نەبووە و کەمێکی تریش ماسییەکە دێتە سەرەوە و تا ئەو کاتەش دەتوانم خۆم ڕاگرم. دەتوانم چییە! قسەی قۆڕ، هەر دەبێ خۆت ڕاگری و ئەرکی سەرشانتە. جارێکی دی ئەم قسە هەڵیتوپەڵیتانە نەکەیتەوە.

لە پێشــکۆی بەلەمەکەدا پــاڵی دایەوە و دووبــارە پەتەکەی بەسەر شانییەوە داگرت. جا لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئێستە پشوویەک دەدەم، هەر کە لە خولخواردنەکەی بووەوە، منیش هەڵدەستم و دەست بە کارەکانم دەکەمەوە.»

بیرۆکەیەکی تەواو سەرسووکانە و بێکێشە بوو کە وچانێک لە پێشکۆی بەلەمەکەدا بدات و واز لە ماسییەکە بهێنێت خوولێکی خۆی بدات و هیچ لە پەتەکە هەڵنەکاتەوە، وەلێ هەر کە لەرزینی پەتەکە ئاماژەی دا کە ماسییەکە بەرەو بەلەمەکە دێت، بەرزەپا هەستایەوە سەر پێ و کەوتە ئەملا و ئەولاکردن و جووڵە تا پارێزگاری لە پەتە هەڵکراوەکە بکات. بیری کردەوە: «بە عەمراتم وەک ئێستە شەکەت نەبووم. وا بای بازرگانی هەڵدەکا و، دەستبارێکی باش دەبێ بۆ من و زۆریش پێویستم پێیەتی.» ئینجا گوتی:

- لە خوولی داهاتوویدا پشوویەک دەدەم، هەست دەکەم زۆر چوستوچالاک و باشم. جا هەمووی دوو سێ خولخواردنی ترە و لە کۆتاییدا گیانی دەردێنم.

شەبقە پووشینەکەی بە پشت سەرییەوە گیرسابووەوە. هەستی کرد ماسییەکە خوول دەخوات و بە تەکانێک پیرەمێردەکەی بە دەمدار خست. بەدەم بیرکردنەوەوە گوتی: «ئێستە پەل بهاوێ هاوڕێ گیان، وەلێ کە گەڕایتەوە تەختت دەکەم.» ئاستی ئاوی زەریاکە بە شێوەیەکی بەرچاو هەڵچووبوو، ئەمەش نیشانەی کەشێکی لەبار بوو و پیرەمێردەکە زۆری پێویست پێی بوو تا بگەڕێتەوە هاڤانا. گوتی:

- ڕووی بەلەمەکە دەکەمە باشوور و ڕۆژئاوا، مرۆڤ هەرگیز لە زەریادا ون نابێ. *کوباش* دوورگەیەکی دوورودرێژە.

لە خولخواردنی سێیەمدا بوو کە پیرەمێردەکە ماسییەکەی بینی. سەرەتا وەک سێبەرێکی ڕەش کە ماوەیەکی زۆری خایاند تا بەژێر بەلەمەکەدا ڕەد بوو، چاوی پێی کەوت. پیرەمێردەکە تاسابوو و بڕوای بە چاوەکانی خۆی نەدەکرد کە بەو ڕادەیەش درێژ بێت. ئینجا گوتی:

- نا ، مەحاڵە ئەوەندە گەورە بێ.

ڕاستییەکەی بەو ڕادەیە گەورە بوو. کاتێک سووڕی سێیەمی تەواو کرد پتر لە ڕووی ئاوەکە نزیک بووەوە و پیرەمێردەکە لە دووریی سی یاردەوە کلکە لە ئاو دەرهاتووەکەی بینی، کە لە دەمی داسێکی گەورە درێژتر بوو. ڕەنگی کلکی شینێکی کاڵ بوو و بەسەر ئاوی شینی تۆخی زەریاوە گەلێک جوان دەردەکەوت. کلکی بەنێو ئاوەکەدا کردەوە و ئەو کاتەی لەژێر بەلەمی پیرەمێردەکەوە مەلەی دەکرد، دەیتوانی قەبەیی و گەورەیی ماسییەکە و خەت و پەڕە وەنەوشەییەکانی لاکانی

ببینێت. پەڕەکانی پشتی لوولیان خواردبوو و ئەوانەی سنگیشی بە تەواوی بڵاو بووبوونەوە.

لە دوابەدوای ئەو خولخواردنەدا پیرەمێردەکە توانیی چاوەکانی و دوو ماسی بۆڕەڵووکیش کە بە چواردەوریدا مەلەیان دەکرد، ببینێت. تاوێ پێوەی دەنووسان و تاوێ لێی جیا دەبوونەوە. ناوبەناویش لە سایەی سێبەرەکەیدا دڵئارام و سەلامەت مەلەیان دەکرد. درێژی هەریەکەیان سێ پێیەک دەبوو و کاتێک خێرا مەلەیان دەکرد، وەک مارماسییەک جەستەیان رادەوەشاند.

جەستەی پیرەمێردەکە یەک چارچە نیشتبووە سەر ئارەقە و تەنها بەهۆی خۆری بەتینەوە نەبوو، بەڵکو شتانێکی تریش. لەگەڵ هەموو خولخورادنێکی هێمنانەی ماسییەکەدا برێک پەتی هەڵدەکردەوە. دڵنیا بوو کە دوای دوو خوولی تر دەتوانێت نیزەکەی تێ بچەقێنێت و بیکوژێت. لە بەرخۆیەوە گوتی: «دەبێ پەلکێشی مەودایەکی نزیکتری بکەم، زۆر نزیک. جا نابێ نیشانە لە سەری بگرمەوە، بەڵکو ڕاستەوخۆ لە دڵی. ئینجا گوتی:

- هێمن و بەهێز بمێنەرەوە پیرەمێرد!

لە خولخواردنی دواتردا پشتی ماسییەکە دەرکەوت، وەلێ کەمێک لە بەلەمەکەوە دوور بوو. بۆ سووڕی پاش ئەویش هەر بە هەمان شێوە، وەلێ زیاتر لە ڕووی ئاوەکە نزیک بووبووەوە. پیرەمێرد گومانی نەبوو گەر کەمێکی دی پەتەکە هەڵبکاتەوە، ئەوا یەکڕاست دەیهێنێتە پەنای بەلەمەکە.

دەمێـک بـوو نێزەبـۆری ئامــادە کردبـوو، کــلافەی پەتە باریکەکەشـی لە سـەبەتەیەکی خـڕدا دانـابوو و ئەوسـەری پەتەکەی بە پێشـکۆی بەلەمەکەوە گرێـدابوو. ماسـیـیەکە خـوولێکی دیکەشـی تەواو کـرد، لەسـەرخۆ و جـوان مەلەی دەکرد و لەنێو ئاوەکەدا تەنها کلکی دەجوولاند. پیرەمێردەکە تا توانیی پەتەکەی ڕاکێشا بۆ ئەوەی زیاتر لە بەلەمەکەی نزیک بکاتەوە. ماسییەکە بۆ ساتێک بە لادا کەوت، کەوتنێکی کەم و کـاتی، پاشـان وەرچەرخـا و کەوتە خولخـواردنێکی تـازە. پیرەمێردەکە گوتی:

- خۆ جوولاندم، هەر بە ڕاستی ماسییەکەم جوولاند!

هەستی بە سەرەگێجەیەکی توند کرد، وەلێ تا توانیی پەتەکەی ڕاکێشا. لە دڵی خۆیدا گوتی: «خۆ جوولاندم، ڕێی تێدەچێ ئەم جارە تا پەنای بەلەمەکەش کێشی بکەم. دەی، دەستینە ئێستە توند ڕایکێشن! ئێوەش ئەی قاچینە توند خۆتان بگرن! تۆش ئەی کەللەسەرەکەی خۆم، لەگەڵمدا بمێنەرەوە! چونکە هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان لێم جیا نەبوویتەوە. ئەم جار تا لێواری بەلەمەکە ڕای دەکێشم.»

بەلام بەر لەوەی ماسـیـیەکە لە بەلەمەکە نزیـک ببێـتەوە، پیرەمێـردەکە بە هەمـوو توانـای خـۆیەوە پەتەکەی ڕاکێشـا و ماسییەکە کەوت بە لادا، جا خۆی ڕاست کردەوە و ڕێی خـۆی بەنێو ئاوەکەدا گرتەوە بەر. پاشان پیرەمێرد گوتی:

- هۆ ماسییەکە، دەست بگری بە بـاڵی هەورەوە مەرگت هەر مسۆگەرە، وەلێ بۆ دەبێ منیش لەگەڵ خۆتدا بکوژی!

ئەمە بیرۆکەیەکی گەمژانەیە و هیچ ئاکامێکی نابێ. زمانی بە مەلاشوویەوە نووسابوو و زاری هێندە وشک بووبووەوە کە گۆی نەدەکرد، ئانوسات دەستیشی نەدەگەیشتە ئاوەکە. لە بیرکردنەوەدا ڕۆچوو: «هەر دەبێ ئەم جارەیان پەلکێشی لێواری بەلەمەکەی بکەم، چونکە لەمە زیاتر بەرگە ناگرم.» جا بە خۆی گوت: «بەرگە دەگری! تاهەتایە بەرگە دەگری!»

لە سووڕخواردنی دواتردا پیرەمێردەکە ئەوەندەی نەمابوو دەستی پێی ڕابگات، وەلێ گورج خۆی ڕاست کردەوە و بە شێنەیی کەوتەوە مەلەکردن.

لە بەرخۆیەوە گوتی: «ئەی ماسییەکە، خەریکە دەمکوژی و بۆ ئەمەش ناهەقت ناگرم، چونکە بە تەمەنم بوونەوەرێکی هێندەی تۆ نازدار، قەشەنگ، جوامێر و گەورە و ئۆقرەگرم نەدیوە برالە گیان. دەی بمکوژە! ئیدی باکم بەوە نییە کێ کێ دەکوژێ.» جا بیری کردەوە: «هەست دەکەم مێشکت خەریکە پەرت و شێواو دەبێ! بیرتیژی و هێمنیی خۆت بپارێزە و فێر بە وەک پیاو بەرگەی مەینەت و دەرد بگری، یانیش وەک ماسییەک!» بە چپەوە گوتی: «وەرەوە سەرخۆت ئەی سەر، وەرەوە سەرخۆت!»

دوو جاری دیکەش ماسییەکە خوولی خوارد و پیرەمێردەکە نەیتوانی نیزەی تێ بچەقێنێت. هەستی کرد خەریکە لە هۆش خۆی دەچێت، پاشان کەوتە دواندنی خۆی: «نازانم، نازانم، وەلێ جارێکی دیکەش هەوڵ دەدەمەوە.» دووبارە هەوڵی دا و، لەوەدا بوو ماسییەکە وەرچەرخێنێت، وەلێ سەرەخولەیەکی هاتێ و گێژی کرد. ماسییەکە خۆی ڕاست کردەوە، کلکی لە

هەوادا دەلەقاند و لەسەرخۆ کەوتەوە مەلەکردن. پیرەمێردەکە دووپاتی کردەوە: «دووبارە هەوڵ دەدەمەوە.» پەنجەکانی توانایان نەمابوو و بەر بینایی تەواو تاریک بووبوو و بۆ چەند ساتێکی کەم نەبێت چاوەکانی هیچیان بەدی نەدەکرد.

هەمدیس گوڕی دایە بەرخۆی و هەوڵی دایەوە، وەلێ هیچی بە هیچ نەکرد. بەرلەوەی هەست بە نزیکبوونەوەی بوورانەوەکە بکات بە خۆی گوت: «بەم جۆرە دووبارە و دووبارە هەوڵ دەدەمەوە.» جا چی گوڕوتین و تینوتاو و نەبەردی هەبوو، کە سالانێکە جەستەیان جێ هێشتووە، بە بەر خۆیدا هێنایەوە. ماسییەکە هێواش‌هێواش لە بەلەمەکە نزیک بووەوە، ئەو ساتەی بە تەک بەلەمەکەدا ڕەد بوو، ئەوەندەی نەمابوو قەپۆزی بە قەراغی بەلەمەکەدا بخشێت. درێژ و گەورە، زیوین و لێوڕێژ لە نەشخونیگاری ئەرخەوانیی بێکۆتا دەردەکەوت.

تاوێک پیرەمێردەکە پەتەکەی فڕێدا و قاچێکی خستە سەر، تا توانیی نێزەکەی بەرز کردەوە، نیشانەی لە لاتەنیشتی ماسییەکە و پشت پەڕەکانی گرتەوە و، تا توانیی بە هەموو هێزی خۆیەوە نێزەی تێچەقاند. پەڕەکانی بەقەد سنگی پیرەمێردەکە گیڤ بووبوونەوە و هەستی بە نووکی ئاسنینی نێزەکە کرد کە بە ناو گۆشتی ماسییەکەدا ڕۆدەچێت، جا خۆی بەسەریدا دا و بە هەموو کێشی لەشییەوە پالی پێوەنا بۆ ناوەوە.

وەک ئەوەی ماسییەکە لە گیانەلادا بێت، تەزوویەکی مەرگ سەراپای جەستەی داگرت و دووبارە وزەی تێکەڕایەوە. خۆی بەنێو ئاوەکەدا کردەوە و بەرەو ژوور بازرەقەی بەست، جا لە

ئاوەکە دەرپەڕی و کۆتـا نمایشـی هێـز و گەورەیـی و جـوانی خـۆی کـرد و، هەر دەتگـوت لە هەوادا و بەسـەر سـەری پیرەمێـردەکەوە هەڵواسـراوە. جـا یەکبیـنە خـۆی بە ڕووی ئـاوەکەدا دایەوە و لە هەر چـوار لاوە پیرەمێـرد و بەلەمەکەی ئاوپرژێن کرد.

پیرەمێـرد بە جۆرێـک سـەرەخولێ و شـەکەتی زۆری بـۆ هێنابوو، بەربینایی تەواو لێڵ و تاریک کردبوو. پەتی نێزەکەی لێکردەوە و بە هێواشـی بەنێو پێسـتی دامـاڵراو و ڕووشـاوی دەستیدا ڕەدی کرد. کە وردەوردە بەرچـاوی ڕوونـاک بووەوە، بینیی ماسییەکە کەوتـووەتە سەر پشت و سکە زیوییەکەشی قنج و قیت وەستاوە. نووکی نێزەکە لاونیو بەنـاو گۆشتەکەیدا چووەتە خوارێ و ئاوی زەریا بە خوێنی دڵی ڕەنگ بووە. لەو زەریـا شـینکارەدا کە میلێـک قـووڵایی بـوو، سـەرەتا ڕەنگـی خـوێنەکەی وەک تەنکەئاوێـک دەچـووەوە، دواتـر وردەوردە وەک گەواڵە هەور بەسـەر ڕووی ئـاوەکەدا پەرش و بـڵاو دەبووەوە. ماسییەکە زیویی و بێجووڵە بەسەر ڕووی ئاوەکەدا کەوتبوو و، جەستەی لەگەڵ شەپۆلەکاندا دەهات و دەچوو.

لەو چەند سـاتە کەمەی بینـایی و بەرچاوڕوونیدا، پیرەمێردەکە سەرسام و واقوڕماو چاوی بڕیبووە ماسییەکە، پەتی نێزەکەی دوو جار بە پێشـکۆی بەلەمەکەوە پێچ دا و سـەری خسـتە نێو لەپی دەسـتییەوە. جا پاڵی دا بە تەختەی پێشکۆی بەلەمەکەوە و گـوتی: «وەرەوە سـەرخۆ و بیـرت سـاف بـکە. مـن پیرەمێردێکی شـەکەتم، وەلێ ئەم براماسـییەم کوشـت و کـارە ساختەکان لەم دەقەیەوە دەست پێدەکەن.»

«سەرەتا دەبێ پەتەکە و جێی بەستنەوەکەی ئامادە بکەم، دواتر ماسییەکە ڕادەکێشمە قەراغ بەلەمەکە، خۆ گەر دوو کەسیش بووینایە و بەلەمەکەمان لار بکردایەتەوە تا ماسییەکەی تێبخەین و هەرچی ئاوێک تێی چووە دەرمان بکردایە، هێشتا هەر لە توانای بەلەمەکەدا نەبوو هەڵی بگرێت. ئێستە پێویستە هەموو شتێک ئامادە بکەم، توندوتۆڵانە بیبەستمەوە، جا هەرکە لەمانە بوومەوە، ستوونەکە دادەنێم و چارۆگەکە هەڵدەدەم و دواتریش دەگەڕێمەوە ماڵێ.»

ماسییەکەی کێش کردە قەراغ بەلەمەکە، تا بوار و جێگەدەستی ئەوەی هەبێ پەتەکە بە ڕیشووەکانیدا بەرێتە ژووری و لە دەمییەوە دەری بهێنێتەوە، پاشان کەللەسەری بە پێشکۆی بەلەمەکەوە گرێ بدات. لە بەرخۆیەوە گوتی: «دەمەوێ بیبینم. دەستی لێ بدەم، هەستی پێ بکەم. ئەوە سەروەت و سامانی منە، گەرچی بۆ سامان و شتی وا نییە کە دەمەوێ هەستی پێ بکەم.» بەردەوامیی بە قسەکانی دا و لە بەرخۆیەوە گوتی: «پێم وایە هەستم بە دڵی کرد، کاتێ بۆ دووەم جار نیشانەم لێگرت و نێزەکەم لە دڵی چەقاند. دەی دەستوبردێ بکە و ڕای بکێشەرە ئێرە. توندتوند بیبەستەرەوە، گرێیەک لە کلکی بدە و گرێ قوولفێکیش لە قەدی، ئینجا بە بەلەمەکەوە بیبەستەوە.» پاشان گوتی:

- دەی خێرا بۆ سەر کار پیرەمێرد!

قومێک ئاوی خواردەوە و جا گوتی: «وا کێشمەکێش و جەنگەکە کۆتایی هات، ئێستە ئیشوکارێکی زۆر چاوەڕێتە.» سەرنجێکی ئاسمانی دا و چاوێکی بە ماسییەکەدا گێڕا، بە

وردی سەرنجی جێگەی خۆری ئاسمانی دەدا. بیری کردەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی: «نیوەڕۆیەکی زووە و ئەوەتا بای بازرگانیش هەڵی کردووە، پەتەکانیش لەمڕۆوە ئیدی کەڵکێکیان نامێنێ. وەلێ هەرکە گەیشتمەوە ماڵ لەگەڵ کوڕەکەدا دەیاندەینەوە سەر یەک.» پاشان گوتی:

- دەی وەرە پێشەوە ماسییەکە.

وەلێ ماسییەکە نەهاتە پێش، بەبێ جووڵە و مت لەسەر ئاوی زەریا کەوتبوو. هەر بۆیە پیرەمێردەکە بە ناچاری بەلەمەکەی بردە پەنایەوە. تاکوو بەلەمەکەی نەبردە ژوور سەری ماسییەکە و بەر قەراغەکەی نەکەوت، بڕوای بە چاوەکانی نەدەکرد کە هێندە گەورە بێت. دەمودەست پەتەکەی لە مێخی پێشکۆی بەلەمەکە کردەوە و بە ڕیشووێکیدا بردیە ناو و لە دەمییەوە هێنایە دەرێ، جا بە ڕمەکەی قەپۆزییدا پێچا و لە ڕیشووەکەی دیکەیەوە بردیەوە ژوور و هەم پێچێکی دیکەی لە قەپۆزی دا و دواجار هەردوو سەرەکەی گرێدان و بە مێخی پێشکۆی بەلەمەکەوە بەستییەوە. ئەوەی مابووەوە لە پەتەکە، بڕیی و بەرەو دواوەی بەلەمەکە کەوتە ڕێ، تا بە هەمان شێوە کلکیشی بە بەلەمەکەوە ببەستێتەوە.

ماسییەکە ئەرخەوانییەکی زیوی بوو، وەلێ هەنووکە یەکپارچە زیوی هەڵگەڕابوو و هێڵەکانی جەستەیشی هەروەک کلکی، شینێکی کاڵ دەیاننواند. ئەم پەڕانە لە دەستی کراوەی پیاوێک، کە پەنجەکانیشی کردبنەوە گەورەتر بوون. چاوەکانیشی بە

چەشنی دووربینی بریسکوب دەرپۆقیبوون، یان وەک مارشێکی ئایینی[1]. پیرەمێردەکە گوتی:

- بێ لەمە هیچ ڕێگایەکی تر نەبوو بۆ کوشتنی.

پاش خواردنەوەی ئاوەکە هەستی بە باشتربوون دەکرد، ترسی بێهۆشکەوتنی نەمابوو و هاوکات مێشکی ساف بوو. بیری کردەوە: «بە لەشولار و قەبارەیدا بێ هەزار و پێنجسەد ڕەتڵێ زیاترە، دەکرێ زۆر لەوە زیاتریش بێ. با بڵێین پاش دەرهێنانی پاشەڕۆی ناوسکەکەی سێیەکی ئەو بڕە دەمێنێتەوە. گەر نرخی هەر ڕەتڵێکیش سی سەنت بێ، کەوابێ چەند دەکا؟ جا گوتی:

- پێویستم بە کاغەز و قەڵەمێ دەبێ تا حسابی بکەم. لەوە دەچێ ئێستە حەوسەڵەی ئەوەم نەبێ. بەهەرحاڵ، ئەمڕۆ دی ماگیۆی مەزن گەر بەم مەسەلەیە بزانێ، ئەوا بە دڵنیاییەوە شانازیم پێوە دەکا. هەرچەندە بە هەموو تەمەنم وەک ئەو تووشی دەرپۆقینی ئێسک نەبووم، وەلێ خوا ئاگادارە داد و بێدادم بوو لەتاو ئازاری پشت و دەستم.

بیری کردەوە: «ئاخر بڵێ دەرپۆقینی ئێسک چییە؟ ڕەنگە تووشی بووبین و هەر ئاگاشمان لێی نەبووبێ.»

---

[1] Procession of saints: مارشێکی ئایینییە، کە وەک بۆنە و یادکردنەوەیەک مەسیحییەکان هەڵدەستن بە سازدانی بۆنەیەک و نیشاندانی پەیکەری مریەمی پاکیزە. ئەم بۆنانە مێژوویەکی کۆنیان هەیە، وەلێ تا دەروبەری سالانی ١٩٢٠ یاد دەکرانەوە و دواتر بەرە بەرە کەم بوونەوە و تا یەکجارەکی خەڵک وازی لێ هێنان.

ماسییەکەی بە پێشکۆی بەلەمەکە و دوا و تەختەی دانیشتنی سەوڵێدانەکەوە بەستەوە. بە ڕادەیەک بە هەیبەت و گەورە بوو، کە پیرەمێردەکە هەستی دەکرد خەریکە بەلەمێکی دیکە بە بەلەمەکەی خۆیەوە دەبەستێتەوە. پارچە پەتێکی بڕی و دەمی بەستەوە، نەوەک بکرێتەوە و خێرایی بەلەمەکە کەم بکاتەوە. جا ستوونەکەی بەرز کردەوە و بە گۆچانە قوولاپییەکەشی چارۆگەکەی کردەوە. بەلەمەکە لە زەریادا ملی ڕێی گرت، پیرەمێردیش لە دواوەی بەلەمەکە نیوە ڕاکشانێک لێی ڕاکشا و بەلەمەکەی بەرەو باشووری ڕۆژئاوا چەرخاند.

پێویستی بە قیبلەنما نەبوو تا پیشانی بدا باشووری ڕۆژئاوا کەوتووەتە کوێ، ئەوەندەی بەس بوو چاوێک بە شەکانەوەی چارۆگەکەدا بخشێنێت و هەست بە بای بازرگانی بکات.

لە بەرخۆیەوە هەڵی دایێ: «باشترە پەتێکی کورت بدۆزمەوە، قولاپێکی چنگاڵی پێوە بکەم و بیهاوێمە زەریا، تا شتێکی پێ ڕاو بکەم و کەمێ گەروومی پێ تەڕ بکەم.»

بەڵام قولاپەکەی نەدۆزییەوە و گشت چەشەکانیش بۆگەنیان کردبوو. نێزەکەی هەڵگرت و چەپکێ گیای زەردی کەنداوی پێ هەڵکێشا، پاشان ڕای وەشاند تا ماسییە ڕۆبیانییە بچووکەکان کە خۆیان پێوە نووساندبوو بکەونە بەلەمەکەوە. بەمجۆرە دەرزەنێک زیاتر ماسی بچووک کەوتنە خوار و هەروەک کێچی زەریا کەوتنە فرتەفرت و هەڵبەزین. پیرەمێردەکە بە کەڵەموست و پەنجەی دۆشاومژەی سەری لە لەشەیان دەکردەوە، بە توێکڵ و کلکەوە دەیجوین و دواتر قوتی دەدان.

ئەم ماسـیانە زۆر وردیـلانە بـوون، وەلـێ بـۆن و بەرامەیـان گەلێک خۆش بوو، بڕێکی زۆریش وزەیان تێدابوو.

دوو پەرداخ ئاو لە شووشەکەدا مابوو، وەلێ هەر بەدەم جوین و قوتـدانی ماسییە ڕۆبیانییەکـانەوە نیـو پەرداخـی خـواردەوە. بەلەمەکە وێڕای کۆسپ و تەگەرەکان، بە باشـی ڕێـی دەکرد و پیرەمێردەکەش سوکانی خستبووە ژێر باسکی و دەیئاژووت. لەو شـوێنەدا کە لێی ڕاکشـابوو ماسـییەکەی لێوە دیـار بـوو، دەبـوو بە وردی سـەیری دەسـتەکانی بکـاتەوە و هەسـت بە ئازاری پشتی بکات، تـا دڵنیا بێتەوە کە ئەمە بە ڕاسـتی ڕووی داوە و زادەی خەون و خەیـاڵ نیـیە. ئەو کـاتەی ملمڵانـێکە خەریکبوو بە کۆتـا بگات و ماندوویەتی لە پەلوپۆی خستبوو، بیـری دەکــردەوە کە دەکرێــت خەون بێــت، بەڵام هەر کە ماسییەکە بـازرەقەی بەسـت و لە ئـاوەکەدا دەرپەڕی و، پێش ئەوەی خـۆی بەنێـو ئـاوەکەدا بکـاتەوە وەک ئەوەی بەسـەر سـەرییەوە هەڵواسـرابێت وشـک بووبـوو، دڵنیـابوو کە شـتێکی سەیر لە ئارادایە و نەیدەتوانی بڕوای پێ بکات. ئەوکات چـاوی ڕەشکەوپێشـکەی دەکرد و نەیـدەبینی، وەلـێ ئێسـتە لە هەمـوو کاتێک ڕوونتر شتەکانی دەدیتن.

ئێسـتە لەوە دڵنیـا بـوو کە خەون نەبـووە، چـونکە ئەوەتـا بە بەرچـاویەوەیەتی، ماسـییەکە و بـرینەکەی دەسـتی و ئـازاری پشــتی. بیــری کــردەوە: «دەســتەکان زوو تیمــار دەبــن. برینەکانیانم پاک کردوونەتەوە و ئـاوە سوێرەکەش تیماریـان دەکـا. ئـاوی لێـڵ و تـاریکی کەنـداو باشـترین دەرمـانی سـەر زەویـیە. لە ئێسـتەدا ئەونـدە پێویسـتە کە مێشـکم سـاف بـکەم. دەستەکان کاری خۆیان کرد و ئەوەتـا بەلەمەکەش بە شێنەیی

و ئاسایی ڕێ دەکا. بەڵێ، ئێمە ڕێ دەکەین، بەم دەمە داخراو و کلـکە قیتبـووەوەیەوە وەک دوو بـرای گیـانیبەگیـانی ڕێ دەکەیـن.» جـا کەمێـک بیـری پەرت بـوو و لە خـۆی پرسـی: «ئەرێ ماسییەکە من کێش دەکا، یاخود من ئەو کێش دەکەم؟ گەر بە شـوێن خۆمـدا ڕامکێشـایە، یـان بەو هەمـوو نەبەردی و هەیـکەلە گەورەیەی خـۆیەوە لەنێـو بەلەمەکەوە بـووایە، ئەوا پرسـیارێک دروسـت نەدەبوو!» وەلـێ هەنـووکە هەردووکیـان گرێـدراو بەیەکەوە ڕێیـان دەکرد. لە بەرخـۆیەوە گـوتی: «گەر ئەوەندە دڵی پێی خۆشە، قەیدی چییە، با ئەو من کێش بکا. خۆ من فرۆفێڵی لـێ دەرچـێ، لە هـیچ شـتێکی تردا لەو باشتر نیم. سـەرباری ئەمـانەش، ئەو هـیچ خـراپە و ئـازارێکی بـۆ مـن نەبووە.»

هەردووکیـان بە هێواشـی ڕێیـان دەکرد، پیرەمێردەکە دەستی وەردایە ئـاوی سـوێری زەریـا و هەولـی دا بیـری بە سـافی بهێڵێـتەوە. چەنـد پەڵە هەورێکـی بەرزی چـڕ و ڕیشـاڵڕیشـاڵ سـێبەریان بـۆ کردبـوو و، بەمەدا پیرەمێـردەکە زانیـی کە بە درێژایی شەو با هەڵدەکات. نیگای چاوانی لەسـەر ماسییەکە لا نەدەدا، تا دڵنیا بێتەوە کە ڕاستییە و خەون نییە! هەڵبەت ئەمە بەر لەوەی پـاش کاتژمێرێـک یەکەم قـرش بەسـەریاندا بـدات. قرشـەکە هەروا لە خـۆڕا و بە ڕێـکەوت دەرنەکەوت، بەڵکـو لە ئەنجـامی ئەو پەڵە خوێنـانەوە کە وەک هەور بەنێـو ئـاوەکەدا بڵاو بووبوونەوە و تـا قووڵایی میلێک بەنێو ئاوی زەریاکەدا تەشەنەیان کردبوو، سەروسەکوتی دەرکەوت. قرشـەکە بێباک و خێـرا فـڕکەی کـرد، ڕووی ئـاوەکەی شـەق کـرد و بە ئاسـماوەنەوە پرشـنگی خـۆری بەرکەوت. جـا خـۆی بەنێـو

ئــــاوەکەدا کـــــردەوە و لە ڕێـــی بـــۆنکردن و هەڵگرتنـــی جێخـوێنەکەوە، شـوێن ماسـی و بەلەمەکە کەوت. پەیتاپەیتـا بۆنخـوێنەکەی ون دەکـرد، وەلـی خێـرا دەیـدۆزییەوە، یـانیش ڕێچکەکەی دەدۆزییەوە و تیژئاژۆ شوێنی بەلەمەکە دەکەوت.

قرشێکی زۆر گەورە بوو، بە *ماکۆ*[1] ناسرابوو، هیچ ماسییەکی زەریـا شـانی لە شـانی نەدەدا و لە هەر ماسـییەکی تـر تیژتـر مەلەی دەکـرد. دەم و قەپۆزیـت لـێ دەرکـردایە، سـەراپای جەستەی جوانی بـوو. پشـتی هەروەک مارلینەکـان شـینکار و سـکی زیـوین و پێسـتەکەی سـاف و لـووس بـوو. گەر ئەم شەویلگە و قەپۆزە زلە ناشرینەی نەبووایە، کە هەنووکە توند لێکـی نـابوو و لەژێـر ئـاوەکەدا تیژئـاژۆ مەلەی دەکـرد، لە مارلینێک جیات نەدەکردەوە! بە پەرە قیتبووەکەی پشتییەوە کە دەتگـوت تیغێکـی پـۆلایینە، بـێ ئەوەی کەمێـک بلەرێـتەوە، ڕووی ئـاوەکەی شــەق دەکــرد. لە دەمە قوجاوەکەیــدا هەر هەشـت ڕیـزە کەڵبەکەی بە بە نـاوەوەدا چەمـابوونەوە و نە لە ددانی ئاسایی شێوە هەرەمی دەچوون، نە لە هی هیچ قرشـێکی دیکەش، بەڵکو لە پەنـجەی دەسـتی مرۆڤێک دەچوون کە وەک چرنووکی باڵندەیەک هێنرابێتنەوە یەک. درێژیی هەر یەکەیـان بەقەد پەنجەیەکـی پیرەمێـردەکە دەبـوو و، لاتەنیشــتەکانیان چەشنی گوێزان تیژ و بڕندە بوو. هەر دەتگوت خوا بۆ ئەوە ئافراندوویەتی تا هەرچی ماسی لەنێو زەریـادا هەیە بە جارێک حەپەلووشـی بکـات. ئیدی تـاکە دژمـن و بەڵای گیـانی ماسـییە دڕندە و تیژڕەوەکانیش هەر ئەم بـاکۆیە بوو. بەدەم بۆنکردنی

[1] Mako: ماکۆ جۆرە قرشێکە کە تـا ئەم سـاتەش خێراتـرین جـۆری قرشـە، کە لە توانایدا هەیە ٦٨کم لە کاتژمێرێکدا ببڕێت و درێژیشی دەگاتە دە پێ.

ماسییەکەوە قرشـەکە تەنگەتـاو و بێئـۆقرە تیژتـر بە پەڕەکەی پشتییەوە کە ڕووی ئـاوەکەی شـەق دەکرد، شوێن ماسـییەکە کەوت. ئەو ساتەی پیرەمێرد قرشەکەی بینی، زانیی کە ئامانی نییە و لە هیچ شتێک ناترسێت و، هەرچییەکی بوێت دەیکات و ناسـڵەمێتەوە. وەختــێ بینیـی قرشــەکە نزیـک دەکەوێـتەوە، پیرەمێـردەکە نێزەکەی ئامـادە کـرد و پەتەکەی گرێـدا. پەتەکە کورت بـوو، چـونکە پێشـتر لە بەسـتنەوەی ماسـییەکەدا بڕێکی زۆری لێ بڕیبوو.

پیرەمێــردەکە بیــری ســاف و گەش بــوو و هەستیشــی بە گوڕوتینێکی زۆر دەکرد، گەرچی ئاسۆی سەرکەوتنی تاریک و ناڕوون بوو. بیری کردەوە و گوتی: «تا ئێسـتە باشـم هێناوە، وەلێ هەر وا نامێنێتەوە!» چاوی بڕیبووە ماسییە گەورەکەی و سـەرنجی هاتنەپێشــەوەی قرشەکەشـی دەدا. لە دڵـی خۆیــدا گـوتی: «ڕەنـگە ئەمەش خەونــێ بــێ، نـاتوانم لە هێرشـکردنی بـخەم، وەلێ ڕەنگە بیکوژم. شـەرت بێ چارەڕەشـت کەم ئەی قرش!»

قرشـەکە گەیشـتە پشـتەوەی بەلەمەکە و پەلامـاری ماسـییەکەی دا. لەو ساتەدا پیرەمێردەکە دەمە داچەقیو و ددانەکانی و چـاوە سەیروسـەمەرەکانیی دەبینــی، کە قەپــاڵی لە گۆشــتی کلکــی ماسییەکە گرت گوێی لێ بوو کە چۆن بە جیڕەوە ددانـی تـێ ڕۆدەکـرد. قرشـەکە سـەری و پشـتی کەوتبـوونە سـەر ڕووی ئـاوەکە و پیرەمێـردیش گـوێی لە دەنگـی دامـاڵینی پێسـت و لێکردنەوەی گۆشتی ماسییەکە بوو. نووکی نێزەکەی لە تەپڵە سـەری چەقانـد، دروسـت لەو خـاڵەی کە هێڵـی درێژبـووەوەی نێوان چاوەکانی و لووتی یەکیان دەگرت. ڕاستییەکەی هێڵگەلی

لەو جـۆرە بوونیـان نەبـوو و تەنهـا سـەرێکی زلـی شـینی پـانەوەبوو و چـاوانێکی گەورە و دوو شـەویلگەی تیـژ و داپلۆسـەر بـوون. بەهەرحـاڵ، نێـزەکەی چەقانـدبووە کاسـەی سـەری، هەرچەنـدە نائومێدانە ڕووبەڕووی بـووەوە، وەلـێ بە دوو دەسـتە خوێنـاویی و خلیسـکەکانییەوە تـا توانیبـووی، نێزەکەی چەقانبووە ئەو خاڵەی سەری.

قرشـەکە کەوتە سـەر لا، پیرەمێـردەکە چاوەکـانیی بینیـی کە تـرووسـکایی ژیانیـان تێـدا بڕابـوو. دواتـر دووبـارە خـۆی وەرچەرخانـدەوە و پەتەکەی دووجـار بە خۆیـدا پـێچ دا و، پیرەمێردەکە زانیی کە کـاری تەواو بـووە و بێهـوودە ئەمـدیو ئەودیـو دەکـات، وەلـێ قرشـەکە خـۆی بەدەسـتەوە نەدەدا. قرشـەکە کەوتە سـەر پشـت و کلکـی لە هەوادا ڕاوەشـاند، جـا باڵەکانی بڵاو کردنەوە و وەک بەلەمێکی تیژڕەوی پێشبڕکێ بە سـەری کلکـی کەفچڕێنێکـی نـایەوە و فـڕکەی کـرد. تـا ئەو ساتەشی پەتەکە گرژبوو و کەوتە لەرزین و سەرئەنجام پچڕا، سێیەکی لەشـی قرشـەکە دیـار بـوو. قرشـەکە هەروا بەسـەر ڕووی ئـاوەکەوە تاوێـک بێجـووڵە مـایەوە و ئینجـا بەرەو بنـی زەریـا شۆڕ بووەوە. پیرەمێردەکە بە دەنگی بەرز گوتی:

- نزیکەی چل ڕەتڵێکی لێ خوارد.

بیری کردەوە: «جـا بریـا هەر ئەوەنـدە بووایە و بەس! نێزە و تەواوی پەتەکەشـی لەگەڵ خۆیـدا بـرد. ئەوەتـا ماسـییەکەشـم دووبـارە خوێنی لێ دەچۆڕێ و گومـانی تێدا نییە قرشـەکانی دیکەش دێنێتە گیانم.» چیدی تـاقەتی ئەوەی نەمـابوو سـەیری ماسـییەکە بکات، پاش ئەوەی قرشەی بەدفەڕ شێواندبووی. ئەو

کاتەی کەڵبەی قرشەکە چووە نێو گۆشتەکەیەوە، پیرەمێردەکە هەستی کرد قەپاڵ لە گۆشتی جەستەی ئەو گیراوە. لە بەرخۆیەوە گوتی: «وەلێ باجی ئەو کارانەی دا و کوشتم، هەر خوا خۆی دەزانێ کە چاوم بە چەند قرش کەوتووە، وەلێ بە تەمەنم ماکۆی[1] ئەونە گەورەم نەبینیبوو.»

بیری کردەوە: «وەک ڕۆژی ڕووناک دەمزانی هەروا بۆم ناچێتە سەر. خۆزگە هەمووی خەونێک بووایە. خۆزگە هەرگیز ئەم ماسییەم ڕاونەکردایە و ئێستە بە تەنیا لەسەر ڕۆژنامە ڕزیوەکانی سەر تەختەخەوەکەم بوومایە» ئینجا گوتی:

- وەلێ مرۆڤ بۆ ئەوە نەئافرێندراوە کە ببەزێ. دەکرێ تێک بشکێت، وەلێ هەرگیز نابەزێ.

بیری کردەوە: «وێڕای ئەوەش گەلێ بە داخ و پەشیمانم لە کوشتنی ماسییەکە، ئەوەتا تا دێ بارودۆخەکە خراپتر دەبێ و نێزەکەشم فت. بیری کردەوە «قرشی ماکۆ دڕندە و بەهێز و بیرتیژە، وەلێ من لەو زیرەکتر بووم. کێ چووزانێ؟ ڕەنگە تەنها چەکێکی باشتر لەوەی ئەوم پێبووبێ.» دواتر بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- بیر مەکەرەوە پیرەمێرد، بەو ئاراستەدا ڕێ بکە و هەر شتەو بۆ کاتی خۆی.

لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڵام پێویستە بیر بکەمەوە، چونکە هەر بیرکردنەوەم بۆ ماوەتەوە. مەبەستم ئەوەیە تەنها بەیسبۆڵ و بیرکردنەوە. تۆ بڵێی دی ماگیۆ ڕای چی بێ لەسەر ئەو

---

[1] Dentuso

لێدانەی من لە تەوقە سەری قرشەکە؟» لە بیرکردنەوەدا ڕۆچوو: «شتێکی ئەوەندە گەورە نەبوو، هەر پیاوێکی دیکەش بووایە دەیتوانی هەمان کار ئەنجام بدا، وەلێ پێت وایە دەستە بریندارەکانم هەر وەک دەرپەڕاندنی ئێسک تەگەر و کۆسپێکی گەورە بن؟ چووزانم، خۆ جگە لەو کاتەی کە مەلەم دەکرد و ماسییەکی سەرقوپاو[1] قەپی بە پاژنەمدا کرد، قەت تووشی ئازاری پاژنەی پێ نەبووم. ئەو گازە بە جۆرێ ئازاربەخش بوو بەشی خوارەوەی قاچمی عاسی کرد و وەخت بوو لە ئازاردا بمرم.» پاشان گوتی:

- بیر لە شتێ بکەرەوە دڵخۆشت بکا پیرەمێرد. ئێستە پاش ئەوەی ڕەتڵێک لە گۆشتی ماسییەکەت لەدەست دا خێراتر زەریا دەبڕی، هەموو خوولەکێکیش زێدە لە ماڵەوە نزیک دەبیتەوە.

باش دەیزانی ئەو دەمەی دەگاتە ناوجەرگەی تەوژمەکان چی دەقەومێ، وەلێ هەنووکە هیچ چارەیەکیشی شک نەدەبرد. بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- بەخێر! چارە هەیە، دەتوانم چەقۆکە بە سەری سەوڵێکیانەوە ببەستم.

چۆنی گوت ئەوەهای کرد. سوکان لەژێر باڵیدا بوو، وەرچەرخێنەری چارۆکەکەش لەژێر پێیدا. ئینجا گوتی:

- ئێستەش هەر پیرەمێردێکی پیرم، وەلێ لانیکەم بێچەک نیم.

---

[1] Stingray

شەماڵێکی خۆشی دەهات و بەلەمەکەش بە باشی ڕێی دەکرد. تەنها لە بەشی پێشەوەی ماسییەکەی دەڕوانی و بەمەش کەمێک هیوای تێکەڕایەوە. دواتر بە خۆی گوت: «ئەوپەڕی گەوجێتییە مرۆڤ هیوا لەدەست بدا. جگە لەوەش، من وەک خۆم بە تاوانی دەزانم. ئاخر چیت داوە لە بیرکردنەوە لە تاوان! خۆت کێشە و گرفتت کەمە، تا سەریشت بپرژێتە سەر مەسەلەی تاوان! قسەی ڕاست خۆشە، من سەری لێ دەرناکەم. لە تاوان تێناگەم و ناشزانم داخۆ بڕوام پێی هەیە یان نا، ڕەنگە کوشتنی ماسییەکە تاوانێک بووبێ. هەر دەبێ واش بێ، وەلێ تەنها لە پای قوتی ژیانی خۆم و هەندێ بەدبەختیی دیکەدا کوشتم. خۆ ئەگەر وابێ ئەوسا هەموو شت دەبێتە تاوان. بەسە ئیدی بیر لە تاوان مەکەرەوە پیرەمێرد. کار لە کار ترازاوە و کەسانێ هەن پارەشیان پێ دەدرێ لەپای تاوانکردندا، واز بێنە با ئەوان بیری لێ بکەنەوە، تۆ چیت داوە لەو مەسەلەیە. تۆ بۆ ئەوە لە دایک بووی تا ببیتە ماسیگر، هەر وەک چۆن ماسییەکە بۆ ئەوە ئافرێندراوە کە ببێتە ماسی. قەشە *سان پێدرۆ* و باوکی دی ماگیۆی مەزنیش هەر ماسیگر بوون.

بەڵام هەمیشە کەڵکەڵەی زانین و خولیای تێرامان و قووڵبوونەوە لە شتەکان، بیروهۆشی داگیر دەکرد. چونکە نە ڕۆژنامەیەک هەبوو بیخوێنێتەوە، نە ڕادیۆیەک گوێی لێ بگرێت، ئەوەی هەیبوو و نەیبوو خەیاڵکردن و بیرکردنەوە بوو. دووبارە هەڵی دایەوە بابەتی تاوان و کەوتە بۆڵەبۆڵ و گوتی: «قابیلە خۆ لە برسان نەمردبووی تا ئەو ماسییە بکوژی، یان بۆ ئەوەی لە بازاڕدا پارەیەکی پێ دەست بخەی،

بەڵکو لەبەر بەخۆنازین و سەرگەرمیی خۆت وەک ماسیگرێک کوشتت. تا لە ژیاندا بوو خۆشم دەویست و، ئێستاش هەر خۆشم دەوێ. ئیدی گەر شتێکیشت لە دڵەوە خۆش ویست، تاوان نییە بیکوژی! یان ئەمەیان زۆر تاوانێکی دزێو و خراپتریشە؟» بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- زۆر بیر دەکەیتەوە پیرەمێرد، زۆر زۆر.

بیری کردەوە: «وەلێ چێژت لە کوشتنی قرشەکە بینی، ئەویش وەک تۆ بە ڕەنجی شانی خۆی و لەسەر ماسیی زیندوو دەژی. وەک قرشەکانی دیکە نییە کە موفتەخۆر بن، بەڵکو جوامێر و بەهەیبەتە و سڵ لە هیچ شتێ ناکاتەوە.» پاشان هاواری کرد:

- من بۆ بەرگریکردن لە خۆم کوشتم، یانی کوشتنی پێویست بوو و چارەیەکی دیکەم نەبوو.

لە بەرخۆیەوە گوتی: «بەو جۆرە بێ، هەموو شتەکان بەربوونەتە گیانی یەک و یەکتری دەکوژن! ڕاوەماسی وەک چۆن دەمژێنێ، ئاوهاش دەمکوژێ، سا هەق بە هەق. کوڕەکەش دووبارە گوڕوتینی ژیانم بە بەردا دەکاتەوە و لەمە زیاتر با خۆم فریو نەدەم.»

بەسەر قەراغی بەلەمەکەدا چەمییەوە و لەو جێیەی قرشەکە قەپی پێدا کردبوو، پارچە گۆشتێکی لێکردەوە و کەوتە جوینی. سەرسام بوو بە بەلەزەتی و باشیی گۆشتەکەی. وەک هەر گۆشتێکی دیکە پتەو و تەڕ و تازە بوو، وەلێ سوور نەبوو و بەدەر بوو لە ڕیشاڵ، باش دەیزانی لە بازاڕدا پارەیەکی چاک دەکات. هیچ ڕێگەیەکی شک نەدەبرد تا خوێنبەربوونەکەی

بوەستێنێتەوە و بمەێنێت، باش دەیزانی کە چ بەڵا و ئاشووبێک چاوەڕێیەتی.

با بەردەوام هەڵی دەکرد. کەمێ ڕووەو باکووری ڕۆژهەڵات ئاراستەی گۆڕیبوو و پیرەمێردەکەش بەمەدا زانیی کە بەم زوانە نایخات و بەردەوام دەبێت. سەرنجی بەردەمی خۆی دا، وەلێ هیچ چارۆکە و دووکەڵی کەشتییەکی بەدی نەکرد. بێ لە باڵندەماسییەکان کە لە پێشکۆی بەلەمەکەدا هەڵبەز و دابەزیان بوو و، گژوگیای زەردباوی *کەنداو* هیچی تری بەرچاو نەدەکەوت. چۆلەکەیەک چییە بۆ دەرمان لەو ناوەدا بەدی نەدەکرا.

بەو جۆرە دوو کاتژمێری ڕەبەق ڕێی کرد. لە پشتەوەی بەلەمەکەدا پاڵی دابووەوە و ناوبەناو پارچە گۆشتێکی دەئاخنییە دەمیەوە، هەوڵی دەدا کەمێ بحەسێتەوە و گوڕوتینی جەستەی پەیدا بکاتەوە. کاتێک بینی دوو قرشی دیکە مرخیان لە ماسییەکە خۆش کردووە و بەرەو بەلەمەکە دێن، هاواری کرد:

- ئای!

ڕێگەیەک شک نابرێت تا ئەم وشەیەی پێ ڕوون بکرێتەوە. دەکرێ تەنها دەنگێک بێت کە نائاگاییانە لە زاری مرۆڤەوە دەردەچێت، کاتێک هەست بە ئازاری بزمارێک دەکات کە دەکوترێت بە دەستیدا و ئەمدیوئەودیو تەختەکەشی پێوە دەسمێت. پاشان هاواری کرد:

- گالانۆس، هەیهوو!

پەڕی دووەم قرشیانی بینی کە پێش یەکەم دەکەوێت و، زانیی لەبەردەم دوو قرشی قەپۆز خاکەنازیدایە. پەڕەکانیان بۆر و سێگۆشەیی بوون و کلکیان گسکئاسا دەجوولاند. بۆنی خوێنی ماسییەکەیان هەڵدەمژی و بە شوێنیدا ئۆقرەیان بڕابوو، وەلێ برسییەتیی تاقەتپڕوکێن و پەلەکردنیان تاوناتاوێک ڕێی لێ بزر دەکردن و ئەوەندەی نەدەخایاند هەمدیس دەیخستنەوە شوێنی. وێڕای ئەمەش تا دەهات نزیک و نزیکتر دەکەوتنەوە لە بەلەمەکە.

پیرەمێردەکە پەتی چارۆگەجوولێنەکەی توند کرد، جا سوکانەکەی جێگیر کرد و دەستی دایە ئەو سەوڵەی چەقۆکەی پێوە بەسترابوو. تا توانیی سەوڵەکەی بە هێواشی بەرز کردەوە، چونکە دەستەکانی بێئەندازە ئازاریان دەدا، زووزوو پەنجەکانی دەنووشتاندنەوە و دەیکردنەوە تا کەمێک نەرم ببنەوە و ئازارەکەیان بڕەوێنێتەوە. جا توند دەستی لە سەوڵەکە گیر کرد و کەوتە چاودێریکردنیان و ئەوانیش بە پرتاو بەرەو بەلەمەکە دەهاتن. دوو سەرە پانە خاکەنازئاساکەیانی بینی، لەگەڵ پەرە نووکسپییە بڵاوبووەکانی سنگیشیان. دوو قرشی چەپەڵ و دزێو، بۆگەن و مشەخۆر بوون. ئەمانە کاتێک برسییەتی زۆریان بۆ دەهێنێت، پەلاماری داروبەرد دەدەن، تەنانەت پەلاماری سەوڵ و قەراغی بەلەم دەدەن و قەپاڵی لێ دەگرن. جاروباریش ئەو کاتەی کیسەڵەکان لەسەر ڕووی ئاوەکە خەویان لێکەوتووە، ئەم قرشە بەدفەڕانە پەلاماری دەست و قاچیان دەدەن و دەیانخۆن. کە برسی دەبن، تەنانەت سڵ لە مرۆڤەکانیش

ناکەنەوە و بێ گوێدانە ئەوەی کە ئایا بۆنی خوێنی ماسییان لێوە دێت یان نا، پەلاماریان دەدەن. پیرەمێردەکە گوتی:

- ئای گالانۆس، دەی وەرە گالانۆس!

وەلێ وەک قرشەکەی پێشوو *ماکۆ* نەهاتنە پێش. دانەیەکیان وەرچەرخا و خۆی کرد بە بنی بەلەمەکەدا، قەپالی لە ماسییەکە دەگرت و پیرەمێردەکەش هەستی بە لەرزینی بەلەمەکە دەکرد. ئەوی دیکەش بە چاوە دەرپۆقیوە زەردباوەکانیەوە لە پیرەمێردەکەی دەڕوانی، جا بە پرتاو دەمی کردەوە و پەلاماری ماسییەکەی دا، ددانەکانی لەو شوێنەدا گیر کردن کە پێشتر قەپی لێ گیرابوو. هێڵە خەیالییەکانی سەرە بۆرەکەی بە ڕوونی دیاربوون، کە لەگەڵ دەمارەکانی دەماغیدا یەکانگیر بووبوون. پیرەمێردەکە نیشانەی لەو خاڵە گرت و چەقۆکەی تێ چەقاند، جا دەریهێنایەوە و ئەم جارە چەقاندییە دوو چاوە زەردباوەکانی کە دەتگوت هی پشیلەن. قرشەکە چارەیەکی دیکەی نەبوو و دەمودەست ماسییەکەی بەردا. دواتر ئەو پارچە گۆشتەی قوت دا کە دایماڵیبوو و بەرە بنی زەریا شۆڕبووەوە و مرد.

بەلەمەکە هێشتا بەهۆی پەلاماری قرشەکەوە دەلەرییەوە. پیرەمێردەکە پەتی جووڵێنەری چارۆکەکەی ڕاکێشا تا بە باری پانیدا بەلەمەکە وەرچەرخێنێت و قرشەکە لە بنیدا بێتە دەرەوە. قرشەکەی نەدەبینی، تا بەسەر قەراغی بەلەمەکەدا چەمییەوە و دایە بەر چەقۆ، وەلێ پێستەکەی زۆر جیڕ بوو و چەقۆکە بە حاڵ دەیبڕی و تێی ڕۆنەدەچوو. ئەم چەقووەشاندنەی پیرەمێرد هەر بە تەنها ئازاری دەستی نەدەدا، بەڵکو شانیشی

پێـوەی کەوتە ژان. قرشــەکە هــاتەوە ســەرەوە و ســەری لە ئـاوەکە دەرهێنـا، لەوەدا بـوو لـووتی بنـێ بە ماسـییەکەوە و قەپالی لێ بگرێت، کە پیرەمێردەکە لەسەر سەری گیرسایەوە و چەقـۆکەی لە تەپڵـی سـەری چەقانـد. پاشـان چەقـۆکەی دەرکێشـایەوە و هەمـدیس چەقاندییەوە هەمـان شـوێن، وەلـێ قرشـەی بەدفەڕ ماسـییەکەی بەر نەدەدا و تونـد ددانـی تـێ گیرکرد بوو. ئەم جارەیان چەقۆکەی چەقاندە چاوی چەپی، کەچـی لەگەڵ ئەوەشـدا لە جێـی خـۆی نەبـزوا. پیرەمێـردەکە گوتی:

- ئەوەندەت بەس نییە؟

چەقـۆکەی لە کڕکـراگە و دەمـاغی چەقانـد، هێـواش و نەرم بەنێویـدا ڕۆچـوو، هەسـتی کـرد کڕکـڕاگەکەی لە یەک جیـا دەبێـتەوە. سـەوڵەکەی وەرچەرخانـد و بە هەمـوو هێـزییەوە چەقۆکەی لە شەویلگەی چەقاند تـا یەکەلای بکاتەوە، جا چەند جارێـک سـەوڵەکەی لە نێویـدا بـادا و قرشـەکە خـۆی بەژێـر زەریادا کردەوە. ئینجا پیرەمێرد گوتی:

- لێرە ون بە، تا قوولایی یەک میل نەوەستی، بڕۆ و لەوێ بە برادەرە ئازیزەکەت شاد بە. چووزانم، ڕەنگە دایکت بێ.

دەمی چەقۆکەی سڕی و سەوڵەکەی خستە پەنایەکەوە. پەتی وەرچەرخێـنەری چـارۆکەکەی گـرت و هەوا کـردیەوە و بەلەمەکە لە زەریـادا ڕێـی خـۆی گـرتەوە بەر. پـاش کەمێـک هاواری کرد:

- قرشــەکان چارەکێـک لە باشـترین گۆشـتی ماسـییەکەیان خوارد. خۆزگە هەمووی خەونێک بووایە، خۆزگە هەرگیز ئەم

ماسییەم ڕاو نەکردایە! ئەمە تەواو خەمبار و بێتاقەتم دەکا ئەی ماسی، تەواوی ڕەنجبەخەسار بووم.

پاشان بێدەنگ بوو. پیرەمێردەکە چاوی بە دیمەنی ماسییەکە هەڵنەدەهات. هەرچی خوێن بوو لە بەری ڕۆیشت و ئاوەکەش لە لاتەنیشتەکانەوە دەیشووشت. ڕەنگی لەو تەلا زیویانە دەچوو کە پشتی ئاوێنەیان پێ دەڕازیننەوە و دەمارەکانی هێشتا بە دەرەوە بوون. گوتی:

- نەدەبوو ئەوەندە دوور بکەومەوە ئەی ماسی، ئەمە لە بەرژەوەندیی هیچ کاممانـدا نەشکایەوە. بمبوورە ماسییەکە! بەداخەوە.

کەوتە دواندی خۆی: «تۆ سەیرێکی دەمی چەقۆکە بکە و بزانە نەشکاوە، جا کەمێ گرنگیش بدە بە دەستت، چونکە ئەم بگرەوبەردەیە کۆتایی نەهاتووە.» پاش ئەوەی چەقۆی پشت سەوڵەکەی پشکنی گوتی: «خۆزگە هەسانێکم[1] لا بووایە تا چەقۆکەم پێ تیژ بکردایە، دەبوو هەسانێ لەگەڵ خۆم بهێنم.» جا بیری کردەوە: «شتانێکی زۆر هەبوون پێویست بوو بیانهێنێ و نەتهێنان. ئێستە ئیدی کاتی بیرکردنەوە نییە لەو شتانەی کە نین و دەبوو هەبن، بیر بکەرەوە کە بەو شتانەی بەردەستت دەتتوانی چی بکەی.» بە دەنگی بەرز گوتی:

- هەیهوو بەسە ئیدی، ئەم هەڵێت و پەڵێتانەم بۆ باس مەکە، بێزاربووم تەواو.

[1] هەسان: جۆرە بەردێکی لووسە، تیغی پێ تیژ دەکرێت.

سوکانی خستە بن باڵی و هەردوو دەستی لە ئاوەکە وەردا، بەلەمەکەش ڕێی دەکرد. ئینجا گوتی: «مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێ ئەم قرشەی دوایی چەنێک گۆشتی لە ماسییەکە خوارد، وەلێ زۆر لە جاران سووکتر بووە.» هیچ کەیفی بەوە نەدەهات بەشی خوارەوەی ماسییەکە بێنێتە پێشچاوی خۆی، پاش ئەو هەموو پارچە گۆشتانەی پێوەی لێکرابوونەوە. هەر لەرینەوە و جووڵانێکی بەلەمەکە مانای لێکردنەوە و داماڵینی کلمتە گۆشتێک بوو. ماسییەکە بە خوێنی لەبەرڕۆییوی شارێیەکی وای دروستکردبوو، کە هەرچی قرشی زەریا هەیە بیگرنە بەر.

لە بەرخۆیەوە گوتی: «دەکرێ ئەم ماسییە زگی مرۆڤێ بە درێژایی زستان تێر بکا، وەلێ واز لەم چەنەدان و بیرکردنەوانە بێنە. تەنها بحەسێرەوە و دەستەکانت تەیار بکە تا بەرگری لەو شتە گۆشتەش بکەی پێوەی ماوەتەوە. بۆنی خوێنەکەی دەستم لەچاو ئەو بۆخوێنەی لە ئاوەکەوە دێ هەر هیچ نییە. سەرباری ئەمەش خۆ دەستی من خوێنی لە بەر ناڕوا. هیچ برینێکی پێوە نییە جێی مەترسی بێ و، خوێن ڕۆیینەکەش دەستم لە کفتبوون دەپارێزێ.»

دووبارە بیری کردەوە: «ئێستە دەتوانم بیر لە چی بکەمەوە؟ هیچ. پێویستە مێشکم بە هیچەوە سەرقاڵ نەکەم و چاوەڕێی قرشەکان بم تا دێن. ئای خۆزگە بە خۆزگای خوا گشتی خەونێک بووایە؟ وەلێ کێ چووزانێ؟ ڕەنگە ئاقیبەتەکەی باش بشکێتەوە.»

قرشی داهـاتوو قرشـێکی دەموقەپۆز خاکەنازی بـوو، سـەری کـردە نێچیـرەکەی هەر وەک بەرازێـک، هەڵـبەتە گەر بەراز دەمێکـی هێنـدە گەورەی هەبـووایە کە جێـی سـەرتی تێـدا بکەیتەوە. قەیرێک پیرەمێردەکە هێشتی گۆشتی ماسییەکە بخوات، جا چەقۆکەی لە مێشکیدا ڕۆکرد، دەمی چەقۆکەی شکا و قرشەکە لارەلار گەڕایە دواوە و کەوتە گیانەڵای مەرگ.

پیرەمێـردەکە چـوو بە لای سـوکانەکەوە و ئـاوڕی لە قرشـە گەورەکە نەدایەوە کە هێواش‌هێواش لە ئاوەکەدا نووقم دەبوو. سـەرەتا زۆر گەورە دیـار بـوو، پاشـان لەگەڵ نووقمبوونیـدا بەرەو ژێر زەریـا بچووکتر و بچووکتر بووەوە. پیرەمێردەکە هەردەم بە جۆشوخرۆشـەوە بـوو بـۆ دیتنـی ئەم دیمەنـانە، کەچی ئەوەتا ئێستە هەر ئاوڕیشی لێ نەداتەوە. گوتی:

- بێ لە گۆچانەکە هیچ شتێکم بە دەستەوە نەماوە، کە ئەویش کەڵکێکی وەهـای نـابێ. هاوکـات دوو سـەوڵ و سـوکانێەک و کوتەکێکی گچکەم پێیە.

بە خـۆی گـوت: «ئێسـتە وەک ڕۆژی ڕوونـاک ڕوونە کە قرشـەکان بەزانـدمیان، مـن کەی لەو تەمەنەدام تـا بە کـوتەک هەموویـان شـەلوپەت بکەم! وەلێ تـا ئەم سـەوڵ و سوکان و کوتەکەشم پێبێ هەر دەکۆشم و کۆڵ نادەم.»

دووبـارە دەسـتەکانی وەردایەوە ئـاوەکەوە، تـا تەڕ بـن و برینەکانیان ببرژێنەوە. درەنگوەختانی ئێوارە بوو و بێ لە ئاو و ئاسمان هیچ شتێکی دیکەی نەدەبینی. با توندتر هەڵی کرد و پیرەمێـرد هیواخـواز بـوو هەرچـی زووە چـاوی بە کەنـار و وشکانی بکەوێتەوە. دواتر گوتی:

- تۆ بێئەندازە ماندووی پیرەمێرد، تا سەر ئێسقان ماندووی!

تـا خـۆر ئـاوا نەبـوو و دونیـا تاریـک دانەهـات هـیچ قرشـێک پەلامـاری نەدا. پیرەمێـردەکە چـاوی بە دوو پەڕی پـانی بـۆر کەوت، کە شــوێن ڕێچکەخــوێنی ماســییەکە کەوتبــوون و لە بەلەمەکە نزیک دەکەوتنەوە. سـەیر لەوەدا بوو ئەم قرشانە لە ڕێـی بـۆنکردنەوە شـوێنی نەکەوتبـوون، بەڵکـو یەکڕاسـت لە پەنـای یەکدا بەرەو بەلەمەکە ملیـان دەنـا. سـوکانی بەلەمەکەی جێگیر کرد و پەتـی جڵەوگری چارۆکەکەی بەستەوە، پاشان کـوتەکەکەی لەژێـر تەخـتەی پشـتەوەی بەلەمەکەدا دەرکـرد. هەڵبەت ئەم کوتەکە بێ لە سـەوڵێکی شکاو کە بە تێپەڕبوونی کات کورت بووبووەوە بۆ دوو پێ و نیو هیچی دیکە نەبوو. بەهـۆی دەسـتگرەکەیەوە، بە یەک دەسـت نەبـوایە بە باشـی هەڵـی نەدەسـووڕاند. پیرەمێـردەکە چاونەترسـانە و تونـد بە دەسـتی ڕاسـت گرتـی، دەسـتی لـێ تونـد کـرد و دەیبینـی کە قرشـەکان نزیک دەکەونەوە، هەردووکیـان لە تـوخمی *گالانۆس* بوون.

بە خـۆی گـوت: «بـا سـەرەتا یەکەم دانەیـان دەمـی تێژەنـێ، ئەوسا بەردەبمە قەپۆز و تەپڵە سەری.» لە یەک کاتدا هەردوو قرشـەکە پەلامـاری ماسـییەکەیان دا. چـاوی لێبـوو کە قرشـە نزیکەکەیــان ددانــی لە ســکی زیــوینی ماســییەکە چەقانــد. کـوتەکەکەی تـا حەوا بەرز کـردەوە و بە هەمـوو هێـزییەوە سـرەواندیە تەپڵە سـەری قرشـەکە. کـوتەکە وەک ئەوەی بەر لاســتیکێکی جیــڕ کەوتبێــت هەڵبەزیــیەوە و پیرەمێــردەکە دەمودەست دەرکی بە ڕەقی و پتەوی ئێسکەکانی کرد. هەر کە

قرشەکە ماسییەکەی بەردا و کشایەوە، پیرەمێردەکە دانەیەکی سرەواندە قەپۆزی.

قرشـەکەی دیـکە پێشـوەختە چەنـد جارێـک سـەری کردبـووە ماسـییەکە و وەرچەرخـابووەوە و، وا هەنـووکە بە دەمە داپچـڕاوەکەیەوە خەریـکە بەرەو ماسـییەکە دێـتەوە. هەر کە پیرەمێردەکە گۆشتی ماسییەکەی بینی لە لێواری دەمیدا سپی دەچووەوە و قرشەکە زیاتر ددانی لێ توند و جیڕ دەکرد، تا توانیی کوتەکەکەی بەرز کردەوە و پێیدا کێشا، وەلێ تەنها بەر سـەری کەوت. قرشـەکە بەدەم لێکـردنەوەی ئەو پـارچە گۆشتەوە کە قەپالی پێدا کردبوو، تەماشایەکی پیرەمێردەکەی کرد، کە ویستی قوتی بدات پیرەمێردەکە دووبارە کوتەکەی تێ سـرەواندەوە، وەلـێ هەروەک جـاری پێشـوو تەنهـا بەر چێـنە ئەستوورە لاستیکییەکەی سەری کەوت. ئینجا پیرەمێرد گوتی:

- وەرەوە قرشەکە! دەی دووبارە وەرەوە!

قرشـەکە بە گـوژمێکی خێراتـرەوە گەڕایەوە، لەگەڵ ددانـی لە گۆشـتەکە گیرکـرد، پیرەمێـرد بە کـوتەک تێـی بەر بـووەوە. کـوتەکەکەی بڵنـد کـرد و بە هەمـوو هێـزییەوە دای بە تەپـڵە سـەریدا، ئەم جارەیـان پیرەمێـردەکە هەسـتی کـرد کـاژەڵاکی سەری پێکاوە. جارێکی تریش لە هەمان شوێنی سرەواندەوە تا گێژی کرد و لاکی ماسییەکەی بەردا. چاوەڕێ بـوو دووبـارە بێـنەوە، وەلـێ هـیچ قرشـێک دیـار نەمـابوو. پـاش کەمێـک دانەیەکیانی بینی بەسەر ڕووی ئاوەکەوە دەسووڕایەوە، وەلێ ئاسەواری پەڕی ئەوی دیکەیان بە دەرەوە نەبوو.

بیـری کـردەوە: «بـڕوام نەدەکـرد بتـوانم بیـانکوژم، گەر تینوتـاوەکەی جـارانم دەمـا، ئەوکـات چارەیـانم دەکـرد، وەلـێ ئێسـتەش کـارێکم پـێ کـردوون کە بەمـزوانە نـایەنەوە سەرخۆیان. گەر دارێکی بەیسبۆڵم پێبووایە، بە هەردوو دەست قـایم تـێم بسـرەواندنایە بـێ شـک یەکەمیـانم دەکوشـت، بە ئێستاشەوە!»

چاوی بە ماسییەکەدا هەڵدەهات، دەیزانی قرشەکان نیوەیان لەتوکوت کردووە. هەر ئەو کاتەش خۆر ئاوا بووبوو، کە ئەم لە گەرمەی شەڕدا بوو لەگەڵ قرشەکاندا. پاشان گوتی:

- کەمێکی تر شەو دادێ، ئەوساکە دەبێ ڕووناکییەکانی هاڤانا ببینم، خۆ گەر زیاد لە پێویست بەرەو ڕۆژهەڵات لامدابێ ئەوە ڕووناکیی یەکێک لە بەندەرە تازەکان هەر بەدی دەکەم.

بیـری کـردەوە: «لەمـڕۆ بەدواوە زۆر دوور نـاکەومەوە لە بەندەرەکان. هیوادارم ئێستە خەمی منیان نەبێ و دڵیان شتێکی نەکردبـێ. بە دڵنیـاییەوە ئێسـتە بەس کـوڕەکە خەمیەتـی، وەلـێ دڵنیام کە بڕوای پتەوە بە من و لێم بێهیوا نابێ. هەست دەکەم زۆرێک لە ماسیگرە پیرەکانیش ئێسـتە خەفەتبار و نـاڕەحەتن، بێجگە لەوان زۆرێکی دیکەش. بە ڕاسـتی لەنێو شـارۆچکە و خەڵکێکـی کەڵکگیـر و خەمخـۆردا دەژیـم.» چیتـر لەگەڵ ماسـییەکەدا قسـەی نەدەکـرد، چـونکە خـراپ گۆشـتەکەیان شێواندبوو. کتوپڕ بیرۆکەیەک بە سەریدا هات و گوتی:

- ئەی نیـوە ماسـییەکە، ئەی ئەو ماسـییەی کە ماسـی بـووی! بیـبوورە کە لە بەنـدەر دوور کەوتـمەوە و قـوڕم بەسـەر هەردووکماندا کرد، وەلـێ مـن و تۆ ژمـارەیەکی زۆر قرشمان

کوشتن و زۆرێکیشمان سەقەت و کەلەلا خستن. ئەی ماسییە پیرەکە، چەند قرشت لە ژیانتدا کوشتووە؟ خۆ بە گاڵتە ئەم ڕمە درێژە بە قەپۆزتەوە نییە!

حەزی دەکرد بیر لەوە بکاتەوە، گەر ماسییەکە زیندوو بووایە و ئازادانە مەلەی بکردایە چی بەسەر ئەو قرشانەدا دەهێنا. بیری کردەوە: «دەبووایە ئەو ڕمەی قەپۆزی لێ بکەمەوە و شەڕی قرشەکان پێ بکەم، وەلێ ئەودەم هیچ تەورێکم پێ نەبوو و هەنووکەش چەقۆکەم شکاوە. گەر بمتوانیایە ئەوە بکەم! گەر بمتوانیایە بە پشتی سەوڵێکییەوە بیبەستم! ئەوسا چەکێکی تۆکمەی لێ دەردەچوو! ئەوکات دووبەدوو دەمانتوانی هەموویان بکوژین. باشە چی دەکەی گەر بەم شەوە دایان بەسەرماندا؟ ئەوکات چیت پێ دەکرێ؟ دواتر گوتی:

- شەڕ! تا سەرەمەرگ شەڕیان لەگەڵ دەکەم!

بەڵام لەو تاریکییە نووتەکەدا، کە هیچ تروسکایی و ڕووناکییەک بەدەرەوە نییە و، تەنها گوێی لە دەنگی با و شەکانەوەی چارۆگەکەیە، هەستی کرد کە مردووە. دەستی هەڵگلۆفی و هەستی بە زیندوویی لەپی دەستەکانی کرد و، زانیی کە نەمردوون و تەنها کەمێک سڕ بوون، بۆ ئەوەی وزە و ئازاری ژیانیان تێکەڕێنێتەوە، ئەوەندەی لەسەرە کە بیانکاتەوە و بیانبووقێنێت. پاڵی بە پشتی بەلەمەکەوە دا و بە شانەکانیدا زیاتر دڵنیا بووەوە کە هێشتاکە زیندووە. بیری کردەوە: «ئەو هەموو ویردەشم لەسەرە کە قەولم دا گەر ماسییەکە ڕاو بکەم بیانخوێنم، وەلێ ئێستە زۆر لەوە

شەکەتترم بتوانم ویرد بخوێنم. باشترە گونییەکە بهێنم و بەسەر شانەکانمیدا بدەم.»

لە پشتەوەی بەلەمەکەدا ڕاکشا و سوکانی گرت و تەماشای ئاسمانی دەکرد تا ڕووناکییەکی تێدا بەدی بکات. جا لە بەرخۆیەوە گوتی: «نیوەی ماسییەکە بە ساغی ماوەتەوە، بەڵکو ئەوە خوایە بەخت یاوەرم بێ و ئەو تۆزەش بە ساغی بگەیەنمەوە بەندەرەکە، ئێ خۆ هەر دەبێ کەمێ بەخت یاوەرم بێ!» دەمودەست بەرپەرچی خۆی دایەوە: «نەخێر، تۆ هەر ئەوکاتە قورت بەسەر بەختی خۆتدا کرد کە لە بەندەرەکە دوور کەوتیتەوە.» پاشان بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- گەوج مەبە! وریا بە و خەو نەتباتەوە، سوکانەکە بسووڕێنە و ئۆقرە بگرە. کێ نالێ بەخت یاوەرت نابێ.

بیری کردەوە: «گەر لە شوێنێ گۆشتی ئەم جۆرە ماسییە بخەنە بازەڕەوە حەز دەکەم بڕێکی لێ بکڕم.» دواتر لە خۆی پرسی: «وەلێ بە چی دەیکڕی؟ بە نێزە ونبووەکەم، یان بە چەقۆ شکاوەکەم، یاخود بەم دەستە زامدار و ماندووانەم!؟» لە دڵی خۆیدا گوتی: «بۆ نا؟ بەو هەشتاوچوار ڕۆژە ڕەبەقە هەوڵت دا بیکڕی کە لە زەریادا بەسەرت برد. هێندەی نەمابوو پێتی بفرۆشن.» ئینجا بیری کردەوە: «پێویستە بیر لە شتی تڕۆهات نەکەمەوە. بەخت بە چەندین شێوە بەرەو ڕوومان دێ، وەلێ کێ دەتوانێ بیناسێتەوە و بڵێ ئەوە بەختە؟ بەهەرحاڵ بە هەر شێوەیەک بێت من کێشەم نییە، سوودی لێ دەبینم و هەوڵی خۆم دەدەم.» دواتر گوتی: «خۆزگە تروسکایی ڕووناکییەکانی هاڤانام بەدی دەکرد، خۆزگە بە زۆر

شت دەخوازم، وەلێ لە ئێستادا تەنها خوازیاری ئەوەم.»
هەوڵی دا بە جۆرێک ڕاکشێت بتوانێت بە ئاسانی سوکانەکە بابدات، بە ئازارەکانی جەستەشیدا لای ڕوون بووبووە کە زیندووە و هێشتا گیانی تێدا ماوە.

نزیک کاتژمێر دە، چاوی بە خەرمانەی ڕووناکییەکانی شار کەوت کە لەسەر ڕووی ئاوەکە پەرش بووبووەوە، لە سەرەتادا ئەم خەرمانەیە وەک ڕوونبوونەوەی ئاسمان پێش دەرکەوتنی مانگ، کاڵ و کز دەرکەوت. بەرەبەرە ڕوونتر و پرشنگدارتر گەشایەوە، ئەو شەپۆلانەی زەریای دەرخستن، کە لە ئەنجامی باکەوە دروست بووبوون. پیرەمێردەکە بەنێو ئاورینگی خەرمانەی مانگدا ڕێی کرد و زانیی کە هێندە ناخایەنێت دەگاتە لێواری تەوژمە ئاوەکان. لە بەرخۆیەوە گوتی: «هەموو شتێک کۆتایی هات، تاوێکی دی قرشەکان هەمدیس پەلامارم دەدەنەوە، وەلێ مرۆڤ لەم تاریکییە ئەنگوستەچاوەدا بێ چەک چیی پێ دەکرێ؟»

هەموو گیانی ڕەق بووبوو، وێڕای ئەمەش کزەی ساردی شەو سەراپای لەشی و برینەکانیی دەکولاندنەوە. بە خۆی گوت: «ئومێدەوارم ناچار بە شەڕێکی دی نەبمەوە، لە ناخی دڵەوە ئاواتەخوازم کە شەڕ بەرۆکم نەگرێتەوە.» نیوەشەو تووشی شەڕێکی دیکە بوو، وەلێ پیرەمێردەکە زانیی ئەم جارە شەڕکردن و پەلهاویشتن هیچ سوودێکی نییە. پۆلێکی تەواو لە قرش هێرشیان کردە سەری، بێ لە هێڵی پەڕەکانیان و بریقەی فۆسفۆرییان، کە سەریان کردبووە ماسییەکە هیچی تری بەدی نەدەکرد. پیرەمێردەکە بێئۆقرانە کەوتە گیانی قرشەکان و کوتەک دوای کوتەکی بە سەریاندا دەسرەواند. گوێی لە جیڕە

دەنگی ددانیان بوو کە لە ماسییەکەیان گیر دەکرد و دەمیان تێ دەژەنت و هەستی بە لەرزینێکی زۆری بەلەمەکە دەکرد، وەک ئەوەی بەسەر پشتیانەوە بێت. نائومێد و بێئۆقرانە کوتەکی بەو شوێنەدا دەکێشا کە دەنگێکی لێوە دەهات و هەستی پێ دەکرد. لەپڕ هەستی کرد شتێک کوتەکەکەی گرت، ئیجا لە دەستی سەندی و کوتەکەش ڕۆیشت.

پیرەمێردەکە سوکانی دەرهێنا، بە هەردوو دەست هەڵی بڕی و بەردەوام و یەک بە یەک قرشەکانی پێ کوتا، وەلێ کەڵکی نەبوو و قرشەکان سەریان کردبووە ماسییەکە، تاوێ یەک یەک دەهاتن و تاوێ بە کۆمەڵ شالاویان بۆ ماسییەکە دەهێنا. قەپالیان لە گۆشتی خۆشی دەگرت کە لەژێر ئاوەکەدا دەبریسکایەوە. لە کۆتاییدا یەکێک لە قرشەکان پەلاماری سەری ماسییەکەی دا، پیرەمێردەکە زانیی کە ڕەنجی بە با چووە و خەریکە ئاسنی سارد دەکوتێ. قرشەکە ددانی لە سەری ڕەقی ماسییەکە گیر بووبوو و نەیدەتوانی گۆشتەکەی بپچڕێنێت. پیرەمێردەکە دووبارە سوکانەکەی بەرز کردەوە و سرەواندییە سەری قرشەکە، جا بێ وەستان و جار لەدوای جار سوکانەکەی دەکێشا بە سەری قرشەکەدا و کۆڵی نەدەدا، تا سوکانەکەش شکا. بە دەسکە شکاوەکەشیەوە وازی نەهێنا و کەوتەوە لێدانی قرشەکە. هەستی کرد خەریکە دەچەقێتە سەری قرشەکە، زانیی کە ئەم دەسکە شکاوە تیژە و دەکرێ کەڵکی هەبێت، جا هەر بەو بارەدا چەند جارێکی تریش بە سەری قرشەکەیدا کێشایەوە، تا قرشەکە کشایەوە و بە لادا کەوت. ئەمە کۆتا قرشی ئەو ڕەوە بوو کە هێرشیان هێنابووە

سەر ماسییەکە، جا ماسییەکەش هیچی بە بەرەوە نەمابوو تا قرشەکان بیخۆن.

پیرەمێردەکە کەوتبـووە هانکەهانـک و لە دەمیـدا هەسـتی بە تامێکی سەیر دەکرد، تامێکی شیرینچک و مسین بوو. سەرەتا ئەمە کەمێک پیرەمێردەکەی ترساند، وەلێ هێندە زۆر نەبوو کە جێی مەترسی بێت. پاشان پیرەمێردەکە تفی کردەوە زەریا و گوتی:

- دەی ئەوە بخۆن قرشـینە، جـا هەر خەون بەوەوە ببیـنن کە پیاوێکتان کوشتووە!

سـوور دەیزانـی دۆڕاوە، جـا چ دۆڕانێکـیش، دۆڕانێـک کە هەستانەوەی نییە. بەرەو دواوەی بەلەمەکە ملی نا و دەسـکی سوکانە شکاوەکەی بینی، بیری کردەوە دەتوانێت لە شـوێنی سوکانەکە جێگیری بکات و کاری ڕێکردنەکەی پێ دەسـتەبەر بکات. شان و ملی بە گونییەکە داپۆشی و بەرەو بەندەرەکە ملی ڕێی گرت. بەلەمەکە بە کـاوەخۆ ڕێـی دەکـرد و ئێسـتە هـیچ بیـرۆکە و خەیاڵێـک مێشـکی پیرەمێـردەی سـەرقاڵ نەدەکـرد. هەموو شتێک کۆتایی هات و هەنووکە تاکە شتێک کە بیری لێ دەکردەوە، گەیشتنە بەندەرەکە بوو بە سەلامەتی. شـەو درەنگ قرشەکان پەلاماری ئێسکە پەیکەری ماسییەکەیان دایەوە و بە چەشنی کۆمەڵە گەدایەک کە بەسەر پاشماوەی سفرە خوانێکدا بـڵاو دەبـنەوە، کەوتـنە کڕانـدنەوەیی و پیرەمێـردەکەش بـاکی پێیان نەبوو. یانی بێ لە جڵەوگرتنی سوکانەکە هۆش و خەیاڵی بەلای هیچ شتێکی دیکەوە نەبوو. تەنها سەنجی ئەوەی دا کە

بەلەمەکە پاش لەدەستدانی کێشی ماسییەکە کە پێوەیە بەسترابوو، چەندە سووک بووە و ئاسان ڕێ دەکا.

بە خۆی گوت: «هیچ نەبێ بەلەمەکە ساغ و سلامەتە، بێ لە سوکانەکەی هیچ شووخت و زیانێکی بەرنەکەوتووە. ئەوەش کارێکی ئەستەم نییە و دەیگۆڕم.» گەیشتە نێو تەوژمە ئاوەکان و ڕووناکییەکانی بەندەرەکەی بەدی کردن. دەیزانی هەنووکە لە کوێیە و گەیشتنە ماڵەوەکەش کارێکی ئاسانە. بە خۆی گوت: «هەرچۆنێ بێ با یاوەرمانە.» بەرپەرچی خۆی دایەوە و گوتی: «هەڵبەت هەموو کات نا. زەریاش بە هەمان شێوە، بەو هەموو دژمن و دۆستەوە کە هەیەتی بۆمان.» پاشان بیری کردەوە: «تەختەوەکەش، تەنها و تەنها تەختەخەوەکە دۆستمە، ئای دەبێ ڕاکشان لە سەری چ هەستێکی خۆش و ناوەزەت پێ ببەخشێ.» جا لە بەرخۆیەوە گوتی: «چەندە شتەکان سانان ئەو کاتەی دەبەزێنرێی! هەرگیز نەمدەزانی کە چ شتێ دووچاری بەزینم دەکا و بەو جۆرەش ئاسانە!»

- هیچ شتێ. هەر ئەوەندە بوو کە زۆر دوور کەوتمەوە.

ئەو ساتەی گەیشتە بەندەرە چکۆلەکە، چاو چاوی نەدەبینی و ڕووناکییەکانی بانیژەکە خامۆش کرابوون و زانیی کە خەڵکی گشتیان نووستوون. لە سەرەتادا بایەکی خۆشی دەهات، وەلێ دواتر با زیاتر هەڵی کرد و بووە گێجەلووکە. بێدەنگی باڵی بەسەر بەندەرەکەدا کێشابوو. تا تەختە کەڵەکەبووەکانی ژێر بەردەکان بەلەمەکەی کرد. کەسێک نەبوو بێ بە دەمییەوە و

بەلەمەکە پـــاڵبنێنە ســـەر وشـــکانی، دواتـــر بە بەردێـــکەوە بەستییەوە و هەر لەوێ جێی هێشت.

ستوونەکەی داگرت و چـارۆگەکەی تێوەپێچـا، ئینجـا دای بە شانیدا و بە هەورازەکەدا هەڵگەڕا. لەو ساتەدا زانیی کە چەندە شـەکەت و مانـدووە. ئیسـتێکی کرد و ئـاوڕی دایەوە و لەژێـر ڕووناکیی چرای کۆڵانەکەدا کلکی درێژی ماسییەکەی بینی، کە لە پێشـکۆی بەلەمەکەدا قیت بووبـووەوە. سـەرنجێکی بڕبـڕەی پشتی دا و وەک پەتێکی ڕووت هاتە بەرچاوی، هەروەها سەرە تاریکداگەڕاوەکەی و ڕمە درێژەکەی قەپۆزی و پێکڕای ئێسـک و پرووســکەکانی نێــوان ســـەری و کلکــی. دارەدار کەوتەوە هەڵـــگەڕان و هەر کە گەیشـــتە لـــووتکەکە بە چـــارۆگەکەی سەرشـانییەوە کەوت و هەر بەو جۆرە بە ڕاکشـاوی قەیرێـک مـــایەوە. هەوڵـی دا هەسـتێتەوە، وەلـێ نەیتـوانی، بە خـۆی و چـارۆگەکەی سـەر شـانییەوە لێـی دانیشـت و چـاوی بـڕییە ڕێگەکە. پشیلەیەک لەوسـەری ڕێگەکەوە هێواش‌هێواش ڕێـی دەکرد و پیرەمێردەکەش لێی دەڕوانی. دواتر تەنها سـەرنجی لەسەر ڕێگەکە هێشتەوە.

چارۆگەکەی لەسـەر شانی داگرت و هەستایەوە، ئینجا دایەوە بە شـانیدا و بەڕێ کەوتەوە. تـا گەیشـتە کوخەکەی پێنج جـار دانیشت و وچانی دا.

چـــووە کـــوخەکە و یەکســـەر ســـتوونەکەی بە دیـــوارەکەدا هەڵپەسارد. لە تاریکیی نووتەکدا بە پەلەکوتێ دەستی گەیاندە شووشـە ئـاوەکە و قومێکی لێ خواردەوە. یەکڕاست خۆی دا بەسەر تەختەخەوەکەیدا و بەتانییەکەی تا سەرشانی هێنا و بە

قاچەکانییدا پیچای. بە دەمدا و بەسەر رۆژنامە کۆنەکانەوە راکشا و خەوی لێکەوت. باسکەکانی بەرەو ژوور درێژ کردبوون و لەپی دەستەکانی روویان کردبووە بنمیچەکە.

بۆ بەیانیی رۆژی دواتر، کاتێک منداڵەکە هات و لە درزی دەرگاکەوە سەرەتاتکێیەکی کرد، ئەو هێشتا لە خەوێکی قووڵدا بوو. با هێندە ناجۆر و توند هەڵی کردبوو و دەیلووراند کەس زاتی ئەوەی نەدەکرد بەندەرەکە جێ بهێڵێت. هەر بۆیە ئەو رۆژە کوڕەکە تا درەنگ لە خەو هەڵنەستا، دواتر هەر وەک رۆژی پێشوو سەرێکی لە کوخی پیرەمێردەکە دایەوە. کوڕە بینیی پیرەمێردەکە هەناسە دەدات، وەلێ کە چاوی بە دەستە بریندارەکانی کەوت لە پرمەی گریانی دا و بە پێدزە کوخەکەی جێ هێشت تا کەمێک قاوەیی بۆ بهێنێت. بە درێژایی رێگە دەگریا و هۆن‌هۆن فرمێسک بە گۆنایدا دەهاتە خوارێ. زۆربەی ماسیگرەکان لەدەوری بەلەمەکە گرد بووبوونەوە و سەراسیمە و واقوڕماو تەماشای ئەو ماسییە زەبەلاحەیان دەکرد کە پێوەی بەسترابووەوە. دانەیەکیان پانتۆڵەی تا سەر ئەژنۆ هەڵکردبوو، پەڕیبووە نێو ئاوەکە و بە پەتێک درێژیی ماسییەکەی دەپێوا. کوڕەکە نەچووە لایان، پێشتر چووبووە ئەوێ و یەکێک لە ماسیگرەکانی راسپاردبوو تا چاوێکی لە بەلەمەکە بێت. یەکێک لە ماسیگرەکان هاواری کرد:

- حاڵی چۆنە؟

کوڕەکە وەڵامی دایەوە: «خەوتووە.» باکی بەوە نەبوو داخۆ ماسیگرەکان گریانەکەی ئەم دەبینن یاخود نا. «تکایە با کەس

بێزاری نەکا.» ئەو ماسیگرەی کە ماسییەکەی دەپێوا هاواری کرد:

- لە کلکییەوە تا قەپۆزی هەژدە پێیە.

کوڕە گوتی: «بەلای منەوە شتێکی سەیر نییە!» پاشان چووە بانیژەکە و داوای قوتوێک قاوەی کرد.

- با گەرم بێ و شەکر و شیریشی تێدا بێ.

- هیچی دیکەت ناوێ؟

- نەخێر، با بزانم دواتر چی پێ دەخورێ.

خاوەنی بانیژەکە گوتی:

- بە ڕاستی ماسییەکی گەورە بوو! هیچ کەس هاوشێوەی ئەوی نەدیبوو. تۆش دوێنێ دوو ماسیی چاکت ڕاو کرد.

کوڕە گوتی: «نەفرەت لە ماسییەکانی من!» لە پرمەی گریانی دایەوە.

خاوەنی بانیژەکە گوتی:

- هیچ خواردنەوەیەکت ناوێ؟

کوڕە وەلامی دایەوە:

- نەخێر، پێیان بڵێن با سانتیاگو بێزار نەکەن. هەر ئێستە دەگەڕێمەوە.

- پێی ڕابگەیەنە زۆر بە داخم سەبارەت بەوەی کە ڕووی داوە!

کوڕەکەش گوتی:

- سوپاس

کوڕه به قوتووه قاوه گەرمەکەوه بەرەو کوخی پیرەمێردەکە ملی ڕێی گرتە بەر. لە پەنایدا دانیشت تا بێدار بووەوە، کەمێ جوولا و کوڕەکە وایزانی بە ئاگا هاتووە، وەلێ لە پرخەی خەوی دایەوە و چووەوە خەوێکی قووڵ. جا بۆ ئەوەی قاوەکەی ساردتر نەبێتەوە کوڕە بەڕێ کەوت تا چەند چیلکە و دارێک بهێنێت و پێی گەرم بکاتەوە. سەرئەنجام پیرەمێرد بەئاگا هات و کوڕەکە گوتی:

- هەڵمەستەوە و ئەم قاوەیە بخۆرەوە.

کوڕە سەرەتا کەمێکی لە پەردەخەکەدا ڕژاند، تا بە پیرەمێردەکەدا نەڕژێت و بیسووتێنێت. پیرەمێرد قوتوورەکەی لە دەستی وەرگرت و هەمووی خواردەوە. دواتر گوتی:

- منیان بەزاند مانولین. خراپ بەزاندمیان!

- هەرچۆنێک بێ گرنگ ئەوەیە ماسییەکە تۆی نەبەزاند.

- بەڵێ ڕاستە، پاش ڕاوکردنی ماسییەکە بەزێنرام.

- پێدرێکۆ ئاگاداری بەلەم و کەلوپەلەکانتە. دەتەوێ چی لە سەری ماسییەکە بکەی؟

- با لێی بکاتەوە و وەک تەڵەی ماسیگرتن سوودی لێ ببینێ.

- ئەی ڕمەکەی قەپۆزی؟

- گەر دەتەوێ، هەڵی گرە بۆ خۆت.

- من دەمەوێ، ئێستە پێویستە قسە لەسەر شتەکانی دی بکەین.

- بەدوامدا گەڕان؟

- بێ گومان، بە یارمەتیی پاسەوانانی بەندەر و فڕۆکەکان.

پیرەمێردەکە گوتی:

- زەریــا گەلێــک گەورەیە و بەلەمــیش بچــووک، هەر بــۆیە ئەستەمە ببینرێی.

پیرەمێــردەکە هەســتی کــرد کە چەنــدە خۆشــکەیف و شــادە هەنــووکە کەســێکی لایە و قســەی لەگەڵــدا دەکــات، بــێ ئەوەی ناچار بێت تەنها خۆی و زەریا بدوێنێت. گوتی:

- بیرم دەکردی مانۆلین، چیت ڕاو کردووە؟

- دانەیەک لە ڕۆژی یەکەم و دووەمدا و دوو دانەش لە ســێیەم ڕۆژمدا.

- ئافەرین.

- لەمڕۆ بەدواوە بەیەکەوە ڕاو دەکەینەوە.

- نا، من کابرایەکی بێشانسم. هەڵبەت دەبێ بڵێم بە یەکجاری بێبەخت بووم.

- چش لە بەخت! من بەخت لەگەڵ خۆمدا دێنم.

- ئەی دایبابت چی دەڵێن؟

- چی دەڵێن با بیڵێن. دوێنێ دوو ماسیم ڕاو کرد، وەلێ لەمڕۆ بەدواوە بەیەکەوە ڕاو دەکەیــن، چــونکە شــتانێکی زۆر هەن کە پێویستە فێریان ببم.

- پێویستە ڕمێکی نووکتیژ دروست بکەین و بەردەوام لەگەڵ خۆماندا بیبەین. دەتوانین پەیکانەکەی لە ئیسپرینگی *فۆررە* شڕەیەکی کۆن دروست بکەین. جا لە *گواناباکو* تیژی بکەین. دەبێ زۆر تیژ بێ و ماددەکەی قەڵب و ناسک نەبێ، بە جۆرێ کە بقرتێ. چونکە چەقۆکەی من شکا.

- چەقۆیەکی ترت بۆ پەیدا دەکەم، ئیسپرینگی ئۆتۆمبێلەکەش تیــژ دەکەمەوە. پێــت وایە ئەم ڕەشـــەبایە تـــا کەی بەردەوام دەبێ؟

- پێدەچێ سێ ڕۆژ، یان زیاتر.

- خۆم هەموو شتێک جەم دەکەم، تۆ ئاگاداری دەستەکانت بە مامەپیرە.

- ئۆو، من باش دەزانم تیماری بکەم. دوێشەو شتێکی سەیرم هەڵهێنایەوە، هەستم کرد شتێ خەریکە سنگم کوون دەکا.

کوڕەکە گوتی:

- بیرت نەچێ و پشتگوێی نەخەی. باش ئاگات لە خۆت بێ باپیرە، لەســەر تەختــەخەوەکەت ڕاکشــێ و منــیش دەچــم کراسەکەت بۆ دێنم، دواتریش شتێک تا بیخۆی.

پیرەمێرد گوتی:

- هەرچی ڕۆژنامەش هەیە هی ئەو ماوەیەی من لێرە نەبووم، هەوڵبدە بۆم پەیدا بکەی.

- پێویستە بە زوویی چاک ببیتەوە و گورجوگۆڵانە بکەویتەوە کار، شتانێکی زۆر ماون کە دەتوانی فێرمیان بکەی. ئازارێکی زۆرت چەشت، وا نییە؟

پیرەمێرد وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ ، زۆر زۆر.

- خۆراک و ڕۆژنامەشت بۆ دێنم، بەس تۆ بە باشی پشوو بدە باپیرە. دەچمە دەرمانخانەیەک و مەرهەمێکت بۆ دەکڕم تا برینەکانتی پێ تیمار بکەی.

- لە بیری نەکەی، بە پیدریکۆ بڵێ سەری ماسییەکە بۆ خۆی هەڵگری.

- خەمت نەبێ، بیرم ناچێ.

کاتێک کوڕە کوخەکەی جێ هێشت و بەسەر بەردە مەرجانییەکاندا داگەڕا، هۆنهۆن دەگریا و فرمێسک بە ڕوومەتیدا دەخزایە خوارێ. عەسری ئەو ڕۆژە کۆمەڵێک گەشتیار هاتبوونە بانێژەکە و ئاهەنگیان دەگێڕا. ژنێک چاوی بڕیبووە ڕۆخی زەریا و قوتووە بیرەی خاڵی و ئێسک و پروسکی ماسیی بەدی دەکرد. ئەوەندەی پێنەچوو سەرنجی خزایە سەر بڕبڕەیەکی گەورە و کلکێکی درێژ، کە لەگەڵ باکەدا دەهات و دەچوو، واقی وڕما و گوتی:

- ئەوە چییە؟

شاگردەکە هاتە گۆ و ویستی بە زمانە کوبایەکەی بەسەرهاتەکەی بۆ ڕوون بکاتەوە. گوتی:

- تیبوورون، قرش!

وای زانیبوو برِبرِەی پشتی یەکێک لە قرشەکانە.

ژنە وەڵامی دایەوە:

- پێشتر نەمدەزانی قرشەکان وەها کلکێکی جوان و نازداریان هەیە!

هاودەمەکەشی لە پەنایەوە گوتی:

- منیش نەمدەزانی!

کەمێ لەولاتر و لە کوخی سەر هەورازەکەدا، پیرەمێردەکە وەک جاری جاران لەسەر دەم خۆی دابوو بەسەر ڕۆژنامە کۆنەکاندا و چاوانی چووبوونەوە خەوێکی قووڵ، کوڕەش لە پەنایدا دانیشتبوو و لێی ورد دەبووەوە. پیرەمێرد خەونی بە شێرەکانەوە دەدیت.

## کورتەیەک لە ناوەڕۆکی ڕۆمانەکە

پیرەمێرد و زەریا چیرۆکی ململانێیەکی دوورودرێژی نێوان پیرەمێردێک و گەورەترین نێچیری ژیانیەتی. بۆ ماوەی هەشتاوچوار ڕۆژ سانتیاگۆ، پیرەمێردێکی نیشتەجێی کوبا، ملی ڕێی بەنێو زەریادا گرتە بەر و لەو سەرەوە بە دەستی بەتاڵ گەڕایەوە. پیرەمێردەکە بە جۆرێک چارەڕەشی تەنگی پێ هەڵچنیوە، کە وا لە دایبابی کوڕێژگەی یاوەر و هاوڕێی سانتیاگۆی پیر دەکات، کوڕەکەیان ناچار بکەن ئەو جێ بهێڵێت و لە بەلەمێکی دیکەی بەبەختدا دەستبەکار ببێت. لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو شەوێک کە پیرەمێردەکە لە ڕاو دەگەڕێتەوە، کوڕەکە دڵگەرمانە دەچێ بەدەمییەوە و یارمەتیی دەدات. کەلوپەلەکانی تا لای کوخە کۆنەکەی لەگەڵ هەڵدەگرێت و خواردەمەنیی بۆ دابین دەکات و قسەوباس لەسەر دواهەمین هەواڵەکانی بەیسبۆڵی ئەمریکا دووبەدوو دەگۆڕنەوە، بە تایبەت پاڵەوانە دڵخوازەکەی پیرەمێرد، کە دی ماگیۆی مەزنە. سانتیاگۆ دڵنیایە کە دەرچەی بەختی هەروا بە داخراوی نامێنێتەوە و بۆ ڕۆژی دواتر بەرەو پانتایی زەریا بەڕێ دەکەوێت.

لە هەشتاوپێنجەمین ڕۆژی بەدبەختیدا، سانتیاگۆ وەک چۆن بەڵێنی دابوو، بەرەو پانتایی زەریا و دوور لە تەنکەئاوەکانی کەنار ملی ڕێ دەگرێت و سەرکێشانە بە نیازی دەستکەوتێکی باش خۆی بەدەم شەپۆلە ترسناکەکانی زەریاوە دەدات بەرەو قوڵاییەکانی گۆڵف ستریم. پیرەمێردەکە پەتەکانی ئامادە دەکات

و فڕێیـان دەداتە قـوڵایی زەریـاوە. دەمەو ئێـوارە، ماسـییەکی گەورە کە سـانتیاگۆ وەک ڕۆژی ڕۆشـن دەزانـێ کە مـارلینە، قەپ بەو چەشـەیاندا دەکـات کە لە قـوڵایی سـەد باڵـدا شـۆڕ کـراوەتەوە. پیرەمێـردەکە لێزانـانە قـوڵاپەکە دەرخـواردی ماسـییەکە دەدات و پێـوە دەبێـت، بەڵام لە توانایـدا نابێـت ڕای بکێشێتە ناو بەلەمەکە، هەر بۆیە ماسییەکە بەلەمەکە بە شوێن خۆیدا کێش دەکات.

پیرەمێرد لە ترسـی ئەوەی کە گەر پەتەکە توند بە بەلەمەکەوە گرێ بدات، ماسییەکە بە تەکانێک دەیقرتێنێت، تـا دوا خوولەک بەرگەی مەینەت و ئـازاری پەتەکە بەسـەر شـان و پشـتییەوە دەگرێـت. ماسـییەکە هەر بەو جۆرە، بەلەمەکە بە درێژایی ئەو ڕۆژە و شـەوەکەی و، ڕۆژی دواتریش بە شـوێن خۆیـدا کێش دەکـات. سـەرەتا ماسـییەکە بە ئاراسـتەی بـاکووری ڕۆژئـاوا دەڕوات، بەڵام دواتر کە ماندوویەتی تەواو برستی لێ دەبڕێت، بەرەو ڕۆژهەڵات ئاراسـتەی خـۆی دەگـۆڕێـت تـا تەوژمەکـان کەمێـک لە ڕۆیشـتنەکەیدا کـۆمەکی بـکەن. بە درێژایـی ئەو کـاتەش، سـانتیاگۆ بەرگەی ئـازاری بەردەوامـی پەتەکەی سـەر شـانی دەگرێـت و لەگەڵ هەر تەکـان و هەڵـبەزین و هەوڵێکـی ماسییەکە بۆ قوتاربوون، پەتەکە بێڕەحمانە دەست و شانەکانی سـانتیاگۆ دادەبڕێت. وێڕای ئەو هەمـوو ئـازار و مەینەتەی کە ماسییەکە بە پیرەمێردی دەدات، دەبینین پیرەمێردەکە لە نـاخی دڵیەوە، جۆرە هاوخەمییەکی بەرانبەر بە مارلین هەیە. بەرانبەر براکەی، کە وەک خۆی، لە ئازار و گوشارێکی قورسدایە.

سێیەم ڕۆژ، ماسییەکە بە یەکجاری برسـتی لـێ دەبڕێت و سانتیاگۆی پیر کە شـەکەتی گەیشـتووەتە مۆخی ئێسکەکانی و

بێخەوی بەرەو حاڵێکی وای بردووە کە لە بەرخۆیەوە وڕێنە دەکات و قسە فڕێ دەدات، ماسییەکە کێش دەکاتە نزیک بەلەمەکە و بە نەیزەکەی دەیکوژێت. کاتێک لە پەنای بەلەمەکەوە بە مردوویی دەگیرسێتەوە، سانتیاگۆ بۆی دەردەکەوێت کە ئەمە گەورەترین ماسییە لە تەمەنیدا بینیبێتی. دواتر بە بەلەمەکەوە دەیبەستێتەوە و چارۆگەکەی هەڵدەدات و بەرەو ماڵەوە رێی خۆی دەگرێتە بەر. لە کاتێکدا سانتیاگۆ سەرقاڵی حساباتی خۆیەتی سەبارەت بەوەی ماسییەکە چەنێک پارەی لە بازاڕدا بۆ دەکات، نیگەرانی ئەوەشە کە ئەوانەی دەیخۆن، بە دڵنیاییەوە شیاوی گۆشتەکەی نین.

لەو کاتەدا کە سانتیاگۆ بە ماسییە گرێدراوەکەی بەلەمەکەیەوە رێ دەکات، خوێنی ماسییەکە رێچکەیەکەی وا بەشوێن خۆیدا و بەسەر ئاوەکەوە جێ دەهێڵێت کە هەرچی قرشی ناو زەریایە بە پەلە شوێنی هەڵدەکەن. یەکەم هێرش لە لایەن قرشێکی ماکۆوە دەکرێت، کە پیرەمێرد بە نەیزەکە دەیکوژێت. لەم ململانێیەی نێوان پیرەمێرد و قرشەکەدا، سانتیاگۆ نێزەکە و بڕێکی باشی پەتی لەدەست دەچێت و ئەمەش وا دەکات کە بێدەسەلات و دەستەپاچە، لەبەردەم ئەگەری هێرشی قرشەکانی دیکەدا بمێنێتەوە. پیرەمێرد بە هەموو توانای خۆیەوە بەرپەرچی قرشەکان دەداتەوە و شەڕیان لەگەڵ دەکات، بەو ڕمە لار و ناتەواوەی خۆیەوە، کە دارێکە و چەقۆیەکی بە سەرەکەیەوە بەستووە، بەر دەبێتە گیانیان. هەر بەوەشەوە ناوەستێت، بەڵکوو سوکانی بەلەمەکەش لێ دەکاتەوە و یەک لەدوای یەک سەری قرشەکانی پێ دەکوتێت. لەم نێوەندەدا سانتیاگۆ چەند دانەیەکی دیکەیان لێ دەکوژێت،

بەلام تـا دێـت ژمارەیـان زیـاد دەکـات و ئیـدی لەگەل نزیکبـوونەوەی ئێـوارە و تاریکـداهاتنی دونیـادا، سـانتیاگۆ تێـدەگات کە ئەمە شـەڕێکی بێهـوودە و بێمانـایە. قرشـەکان گۆشتی ماسییەکە هەلاهەلا دەکەن و تەنها ئێسکەپەیکەرەکەی دەهێلنەوە. دواتر سانتیاگۆ دەکەوێتە سەرکۆنەکردنی خۆی، کە زیـاد لە پێویسـت دوور کەوتەوە و نێچیـرە مەزن و جوامێرەکەی لەو نێوەنـدەدا کـردە قوربـانی. بەر لەوەی خـۆر هەلبێت و یەکەمین پرشنگی دونیا ڕۆشـن بکاتەوە، سـانتیاگۆ دەگاتەوە کووخەکەی و یەکسەر خەوێکی قوول دەیباتەوە.

بەیـانیی ڕۆژی دواتـر، کۆمەلێـک ماسـیگری سەرسـام و واقوڕمـاو دەوری ئێسـکەپەیکەری ماسـییەکە دەدەن، کە هێشـتاکە بە بەلەمەکەوە گـرێ دراوە. هـیچ وردەکـارییەک سـەبارەت بە ململانـێ و کێشمەکێشـی پیرەمێردەکە نـازانن و گەشتیارەکانی ئەو ناوەش هەر زوو تێبینیی کەلاکی مارلینەکە دەکەن و وا دەزانـن کە ئێسـکەپەیکەری قرشـێکی گەورەیە. مانۆلین کە بزربوون و نەگەڕانەوەی پیرەمێردەکە تەواو پەکی خستبوو، کاتێک پیرەمێردەکە لەنێو جێگەکەیدا بە نووستووی دەبینێت، یەکسەر لە پرمەی گریان دەدات. جا کوڕەکە قاوەیەک و ڕۆژنامەکانی بەیسبۆلی ئەو ماوەیەی کە پیرەمێردەکە لەوێ نەبـووە، دەهێنێـت و دادەنیشـێت و تەماشـای پیرەمێـردەکە دەکـات. هەر کە پیرەمێرد بە ئاگـا دێت، هەردووکیـان لەسـەر ئەوە ڕێـک دەکەون کە پـێکەوە ڕاوەماسـی بـکەن. دواتـر پیرەمێردەکە خەوی لێ دەکەوێتەوە و وەک هەمیشـە، خەون بە شێرەکانی ڕۆخ زەریای ئەفریقاوە دەبینێت.

## لیستەی کەسایەتییەکان

**سانتیاگۆ-** پیرەمێردی ناونیشانی ڕۆمانەکەیە. ماسیگرێکی کوبییە و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ دووچاری بەدبەختی بووە. سەرەڕای ئەزموون و لێزانی لە کارەکەی خۆیدا، کەچی بۆ ماوەی هەشتاوچوار ڕۆژ هیچ ماسییەک ڕاو ناکات. کەسێکی تا بڵێی سادە و بێفیزە، بەڵام لە هەمان کاتدا، جوامێری و شانازییەک لە توانا و لێهاتوویی خۆیدا بەدی دەکات. زانیاری و شارەزایی سەبارەت بە زەریا و بوونەوەرانی ناوی و کارەکەی، تەواو بێوێنە و وردن و بێ گوێدانە حاڵەتەکەی، یارمەتیی دەدەن گەشبینانە پێشبینیی جۆرێک لە هیوا بکات، ئەمە جگە لەوەی کە ورەی بەرز دەکەنەوە و وا دەکەن زیاتر بڕوای بە کارەکەی خۆی هەبێت. بە درێژایی ژیانی، سانتیاگۆ چەندین ململانێی کردووە، تا هێز و توانای پشوودرێژی خۆی بسەلمێنێت. ئەو مارلینەی کە سێ ڕۆژ بە قولاپەوە دەبێت و پیرەمێردەکە هەوڵی کوشتنی دەدات، گەورەترین نێچیر و ڕکابەری ژیانیەتی. لەگەڵ ئەوەشدا کە ماسییەکە لەدەست دەدات، بەڵام بە شێوەیەکی ناکۆک و دژیەک، دەکرێ بوترێت کە هێشتا گەورەترین دەستکەوت و سەرکەوتنی پیرەمێردەکەیە.

**مارلین-** سانتیاگۆ هەر لە یەکەمین ئێوارەی ڕاوکردنیدا، مارلینەکە ڕاو دەکات، کە لە کۆتاییدا دەردەکەوێت هەژدە پێ درێژە. بە هۆی گەورەیی مارلینەکەوە، سانتیاگۆ لە توانایدا نابێت کە کێشی بکاتە پەنای بەلەمەکە و بیکوژێت. هەر بۆیە،

هەردووکیـان لە شـەڕێکدا پـێکەوە دەبەسـترێن، کە زیـاتر لە هاوپەیمـانییەک دەچێت نەوەک ململانێ! پەتی قولاپەکە زیـاتر ئامـاژەیە بەو پەیوەنـدی و هەسـتە برایـانەیەی کە پیرەمێردەکە بەرانبەر بە ماسییەکە هەستی پێ دەکات. کاتێک کە مـارلینەکە دەکوژێـت و دواتـر لە لایەن قرشـەکانەوە هەلاهەلا دەکرێـت، سانتیاگۆ هەسـت بە هەمـان هەلاهەلابوون و تێکشکان دەکات. هەروەک سانتیاگۆ، مارلینەکەش بە هەمـان شێوە چوێنراوە بە مەسیح.

**مانۆلین** – کوڕێکە لە تـافی هەرزەکاریدا. بەردەست و هاوکـار و هـاوڕێی سـانتیاگۆیە. کاتێـک کە تەمەنـی تەنهـا پێـنج سـاڵە، پیرەمێردەکە بۆ یەکەم جـار سـواری بەلەمـی دەکات. بە هـۆی بەدبەختییەکەی سـانتیاگۆوە، کە لەو دوایـانەدا تووشـی بـووە، دایبـابی مـانۆلین، کوڕەکەیـان ناچـار دەکەن کە سـانتیاگۆ جـێ بهێڵێت و لە بەلەمێکی دیکەدا دەستبەکار ببێت. بەڵام مـانۆلین هەر دڵی لای پیرەمێردەکە دەبێت، دڵگەرمـانە یـارمەتیی دەدات و وەک سەرمەشـق و مامۆسـتایەکی خـۆی لێـی دەڕوانێـت. خۆشەویستیی مانۆلین بۆ سانتیاگۆ، خۆشەویستییەکی بێبەردە و ئاشـــکرایە، وەک چـــۆن بە ڕوونـــی ئاســـەواری ئەم خۆشەویستییە بەدی دەکەین، کاتێک دووبەدوو قسـە لەسـەر بەیســـبۆڵ دەکەن و مـــانۆلین هەوڵ دەدات کـــۆمەک لە لادێنشینەکان کۆ بکاتەوە، تا حاڵی پیرەمێردەکە باشتر بکات و ئەو دۆخە سەختە تێپەڕێنێت.

**دی ماگیۆ** – هەرچەندە کەسایەتیی دی ماگیۆ، بۆ جارێکیش لە ڕۆمانەکەدا دەرناکەوێت، بەڵام ڕۆڵێکی گرنگ و بایەخداری لە چیرۆکەکەدا هەیە. سانتیاگۆ وەک نموونەی هێز و پابەندبوون

سـەیری دەکـات. ئەو کاتـانەی کەمێـک بێهیـوا دەبێـت، پەنـا دەباتەوە بەر بیرکردنەوە لە گەورەیی دی ماگیۆ، تا لە ڕێیەوە ورەبەرزی و ئومێدی خـۆی قەرەبوو بکـاتەوە. وێڕای ئەوەی کە نەخۆشیی دەرپەڕینی ئێسکی پاژنە زۆری بۆ هێناوە، بەلام ئەمە نـابێتە کۆسـپێک لەبەردەم یـاریزانێکی گەورەی وەک دی مـاگیۆدا تـا ڕێ لە سـەرکەوتن و پاراسـتنی دەسـتکەوتەکانی بگرێـت. لە سـالانی ١٩٣٦-١٩٥١دا دی مـاگیۆ یـاریزانی ناوەڕاسـتی یـانەی یانکییەکـان بـوو و بە باشـترین یـاریزانی ناوەڕاستیش دادەنرێت لە مێژوودا.

پێریکـۆ – ڕەنـگە خـوێنەر سـەرنجی ئەوەی دابـێ، کە ئەم کەسـایەتییە لە شـارۆچکەکەدا خـاوەنی بۆدیگـایە. هەرگیـز لە ڕۆمـانەکەدا دەر ناکەوێـت، بەلام ڕۆلێکـی گرنگـی لە ژیـانی ماسـیگرەکەی ئـێمەدا هەیە، کە ڕۆژنامەکـانی تـایبەت بە بەیسـبۆلی بـۆ دابـین دەکـات. ئەم جـۆرە هەلسـوکەوت و کارانەش، کەسایەتیی پێریکۆ، وەک یارمەتیدەرێکی سـانتیاگۆی پیر دەخاتە پێشچاوی خوێنەر.

مارتین – وەک پێریکۆ، مـارتینی خـاوەنی قاوەخـانەکە، هەرگیز لە ڕۆمانەکەدا دەرناکەوێت. بەلکو خوێنەر لە ڕێی مـانۆلینەوە، کە بۆ هێنـانی نـانی شـێوی سـانتیاگۆ دەچێتە لای، پێی ئاشنا دەبێت. وەک پیرەمێردەکە دەلێ، مـارتین لە پیاوە بەخشـندە و دەستبلاوەکانە و لەبەرانبەردا دەبێت پاداشت بکرێت.

**سانتیاگۆ** - هەر لە لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە سانتیاگۆ هەشتاوچوار ڕۆژ هیچ ماسییەکی ڕاونەکردووە و بەمەش بووەتە گاڵتەجاڕی نێو ماسیگرەکانی دیکە. دواتریش لەگەڵ مارلینەکەدا دەکەوێتە ململانێ و بەرگەی ئەو هەموو ئازار و شەکەتییە دەگرێت تا لە کۆتاییدا بە چاوەکانی خۆی ببینێت کە لە لایەن قرشەکانەوە بە تەواوی شەلوکوت دەکرێت. بەڵام ئەوە شکستە کە وا لە پیرەمێردەکە دەکات ئەزموونێکی تازە بچێژێت و سەرکەوتن و ژیانێکی نوێ لەو شکستەی خۆیەوە دەست بخات. دواجار سانتیاگۆ پیرەمێردێکە کە توانا جەستەییەکانی بەرەو لاوازی و لەناوچوون دەچن، بەڵام خوێنەر تێدەگات کە سانتیاگۆ لە ڕێی مانۆلینەوە پاش مەرگی خۆیشی بەردەوام دەبێت، چونکە مانۆلین وەک بەردەستێک چاوەڕێیە کە وانەی زیاتر لە پیرەمێردەکەوە فێر بێت و بەم جۆرەش، پاش مەرگی سانتیاگۆ هەمان ئەزموونی ئەو هەڵدەگرێت. بەم جۆرەش ڕەنگە سانتیاگۆ بگات بە بەرزترین پلەی جوامێریی پەرجووئاسای خۆی: کە دۆزینەوەی ڕێگەیەکە تا دوای مەرگیش هەر بەردەوام بێت و لەناو نەچێت!

سووربوونی سانتیاگۆ لەسەر ئەوەی کە دوور لە هەر ماسیگرێکی دیکە بچێتە پانتایی زەریا، ئاماژەیە بە هەستی قووڵ و تۆکمەی بەخۆنازین و براپەخۆبوون لە ناخیدا، هاوکات دڵنیایی خۆیشی نیشان دەدات سەبارەت بە گۆڕانی ڕێچکەی

بەختـــی. دواتـــر و پـــاش ئەوەی قرشـــەکان دەســـتکەوتەکەی دەخۆن، سانتیاگۆ دەکەوێتە سەرکۆنەکردنی خۆی، کە بەهۆی بەخۆنازین و لووتبەرزییەوە هەم ڕەنجی خۆی و هەمیش هی ماسییەکەی بە با دا. دەکرێ ئەم قسەیە لەجێی خۆی بێت، بەڵام ئەمە تەنها لایەکی مەسەلەکەیە، چونکە لە لایەکی دیکەوە شانازی وا لە سانتیاگۆ دەکات کە بکات بە کەسایەتیی تەواو و ڕاستەقینەی خۆی، ڕێزێکی زیاتری لەنێو ماسیگرەکاندا بۆ دەستەبەر بکـات و یـاوەریکردنی و کارکردنەوەشـی لەگەڵ کوڕەکەدا بۆ مسۆگەر دەکات. ئیدی سانتیاگۆش خۆی باش دەزانـــێ، کە هەرگیـــز پێویســـت ناکـــا بەرگەی ئـــازار و ئەشکەنجەیەکی وا زۆر بگرێتەوە.

ئەوەی کە توانـای بەرگەگـرتن دەداتە سـانتیاگۆ، شـانازی و بڕوابەخۆبـوونە. دەکـرێ بڵێـین کە کـۆڵنەدان و پشـوودرێژی گرنگترین لایەنی جیهان و دونیابینیی هێمینگوەیین- جیهانێک کە مەرگ و شکست بەشێکی دانەبڕاوی سرووشتی ژیانن و هەرگیـز ناکرێـت پشـتگوێ بخـرێن و مـرۆڤ خۆیـانی لـێ بـدزێتەوە. هێمینگوەی لەو بـڕوایەدایە کە لەم نێوەنـدەدا تەنهـا دوو بژاردە هەن: بەزیـن یـاخود بەرگەگرتن تـاکوو تێکشکان. ئیدی وەک ڕۆژی ڕۆشنیش دیارە، کە سـانتیاگۆ دووەم بژاردە هەڵـدەبژێرێت. کـۆڵنەدان و پشـوودرێژی لای سـانتیاگۆ تـا ڕادەیەک ئەفسـانەیی و مەسیحناسـایە. بـۆ مـاوەی سـێ ڕۆژ سانتیاگۆ ئەو پەتەی کە دەستی دادەبڕێت و پشتی ئەشکەنجە دەدات، تونـد دەگرێـت و بەری نـادات. هەڵـبەت ئەم ئـازارە جەستەییانە وا لە سانتیاگۆ دەکەن کە پەیوەندییەک لە سەروو سنووری پەتەکەوە لەگەڵ ماسـییەکەدا ببەسـتێت. دواجـار ئەم

ئازارە جەستەییانەی جەخت لەسەر لێهاتووی و توانای خۆی دەکەنەوە و ئەوەشی کە ماسییەکە ڕکابەرێکی شایستە و لێهاتووە، ئیدی خۆیشی مادام لە توانایدا هەیە بەرگەبگرێت و بە سەختی بەرەنگار بێتەوە، مانای وایە کە ماسیگرێکی لێوەشاوەیە. لە لایەکی تریشەوە، ئەو پەیوەندییەی کە لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا هەیەتی، سانتیاگۆ دەگەیەنێتە پلەیەک کە لە سەروو ئەو شکستەوەیە کە تووشی بووە. ڕێک وەک مەسیح. سانتیاگۆ ئاشکرا چوێنراوە بە مەسیح، وەک لە کۆتایی ڕۆمانەکەشدا دەیبینین، ئازار و دەردیسەرییەکان، پیرەمێردەکە بەرەو سەرکەوتن و ئاسوودەگییەکی ڕۆحی گەورەتر دەبەن.

مانۆلین –تەنها لە سەرەتا و کۆتایی ڕۆمانەکەدا دەردەکەوێت، بەڵام گرنگییەکی ئەوتۆی هەیە لە چیرۆکەکەدا، چونکە گرنگیدان و خزمەتکردنی سانتیاگۆ لە لایەن مانۆلینەوە، پێگە و ڕێزی پیرەمێردەکە لەناو ماسیگرەکاندا بەرزتر دەکات. مانۆلین خۆشەویستی و ملکەچیی خۆی بۆ پیرەمێردەکە دەردەبڕێت و دڵنیا دەبێتەوە لەوەی کە بەشی پێویست خواردەمەنی و بەتانی و جلی هەیە و کەسیش بێزاری ناکات. وێڕای سووربوونی هێمینگوەی لەسەر ئەوەی کەسایەتییەکانی، پیرەمێرد و کوڕیژگەیەکی ڕاستەقینە بن، گەر ورد سەرنج بدەین دەبینین کە پاکی و تەنیایی مانۆلین زیاتر وەک سیمبولێک دەر دەکەوێت. بێ گومان کردار و چالاکییەکانی مانۆلین لە دوودڵی و دووهەستکەوتنەوە، یان خۆبەزلزانییەکی هەرزانەوە سەرچاوە ناگرن، بەڵکوو زۆر بە سادەیی، هاودەمێکی پیرەمێردەکەیە، کە جگە لە یارمەتیدان و خۆشەویستی، هەست بە هیچ شتێکی دیکە ناکات.

هیمینگوەی ئاماژە بە وەفا و گوێڕایەڵیی مانۆلین دەدات بۆ باوکی، کە نایەوێ بێگوێییان بکات و لەگەڵ پیرەمێردەکەدا بمێنێتەوە کە هەشتاوچوار ڕۆژە هیچ ماسییەکی ڕاو نەکردووە. ئەم کردەی جێهێشتنەش کوڕەکە زیاتر وەک مرۆڤێکی ڕاستەقینە نیشان دەدات، مرۆڤێک کە لە وەفا و ملکەچی بۆ خێزانەکەی ڕاڕایە، دووچاری بڕیاری سەخت دەبێتەوە. لە کۆتایی ڕۆمانەکەشدا، کوڕە کارەکەی کە لە لایەن باوکیەوە پێی ڕاسپێردرابوو، جێ دەهێڵێت و بڕیار دەدات کە دووبارە لەگەڵ سانتیاگۆ ڕاو بکاتەوە، ئەوەش بێ گوێدانە ئەوەی کە تووشی چ سزا و دەرئەنجامێک دەبێت. لە کۆتایی چیرۆکەکەدا مانۆلین وەک ئاماژەیەکی پاکی و خۆشەویستیی بەتین دەردەکەوێت. دواتر وەک بەردەستێکی پیرەمێردەکە، ئەو بەردەوامبوون و ژیانی پاش مەرگە نیشان دەدات کە بە سانتیاگۆی دەبەخشێت. کەڵکەڵەی فێربوونی مانۆلین لە سانتیاگۆوە، ئەوەمان بۆ پشتڕاست دەکاتەوە کە سانتیاگۆ پاش مەرگیشی لە ناخی کوڕەکەدا ڕەنگ دەداتەوە و لە ژیان بەردەوام دەبێت!

ەر لە لاپەڕەکانی سەرەتادا، سانتیاگۆ وەک کەسایەتییەک یشان دراوە کە لە ململانێی شکستدایە. جا هەروەک یرخەرەوەیەکی بارودۆخەکەی، وەسفی چارۆکەکەی کراوە، کە وەک بەختی لە ئالایەکی بەزیو و شکستخواردووی مەتامەتایی دەچێت. پیرەمێردەکە بە هەموو شێوەیەک شکست و کۆلدان ڕەد دەکاتەوە و بڕیار دەدات دوور لە هەموو ماسیگرەکانی دیکە، ڕێی خۆی بەرەو ئەو جێیەی کە گەورەترین ماسیی لێیە، بگرێتە بەر. پاش هەشتاوحەوت ڕۆژ کە ژمارە پێوانەییەکەی ئەوە و دوای ماندووبوونێکی تاقەتپڕوکێنی سێ ڕۆژسی بەردەوام، لە کۆتاییدا مارلینەکە دەکوژێت. دواتر، وێڕای ئەوەی کە دەزانێت شەڕی قرشەکان بێهوودەیە و کار لە کار ترازاوە، لە بەرەنگاربوونەوەیان بەردەوام دەبێت.

لەبەر ئەوەی پیرەمێردەکە بەزەیی بە گیاندارانی دەریادا دێتەوە، خوێنەر ڕەنگە چیرۆکەکە بە چیرۆکی پیاوێک کە بەرەنگاری ژینگەی دەرەوە و سرووشت دەبێتەوە، ببینن، بەڵام گەر وردتر لێی بڕوانین، تێدەگەین کە ئەمە چیرۆکی پیاوێکە لە نێوجەرگەی سرووشتدا. هەردووکیان، سانتیاگۆ و مارلینەکە، نمایشی چەمکەکانی، شانازی، نەبەردی، کەرامەت دەکەن و هاوکات هەردووکیشیان لەبەردەم یاسایەکی نەگۆڕ و هەمیشەییدا وەستاون، کە یان ئەوەتا دەبێت بکوژن، یان بکوژرێن! ئەم بیروبۆچوونەش، دروست لەو ساتەدا دەپەڕێتە

سەری پیرەمێرد کە تەماشای باڵندە چکۆلەکە دەکات، کە بەرەو ڕۆخ زەریا دەفڕێت و، دڵنیایە کە دەبێت بە تووشی هەڵۆ، یان باڵندەیەکەی دڕندەی دیکەوە. دواجار جیهان بە دڕندە تەنراوە و هیچ بوونەوەرێکیش نییە لەم ململانێیە قوتاری ببێت و خۆی لە داوی مەرگ ڕزگار بکات! سانتیاگۆ بە پشتبەستن بەو بڕوا و نەریتانە دەژی کە باوەڕی پێیانە. «مرۆڤ بۆ ئەوە نەئافرێندراوە کە ببەزێت، دەکرێ تێک بشکێت، وەلێ هەرگیز نابەزێت.» لە دونیابینیی هێمینگوەیدا، مەرگ حاڵەتێکی نەگۆڕ و ئەبەدییە و هەمووان ڕووبەڕووی دەبنەوە، وەلێ بەهێزترین مرۆڤ یاخود بونەوەرەکان ئەوانەن کە بە ئاسانی وزە و توانای خۆیان ڕادەستی ئەم پێشهاتە دزێو و سامناکە ناکەن. بەم جۆرەش، ماسییەکە و پیرەمێرد و تەنانەت ئەو قرشانەش کە بەسەر دەستکەوتی پیرەمێردەکەدا دەدەن، لە ململانێی مەرگدان.

ڕۆمانەکە ڕێگەیەکمان نیشان دەدات، کە دەکرێت ئەم بنەما و یاسایانە تێپەڕێنرێن. ڕاستییەکەی ئەگەری تێکشان و دڵنیایی تووشبوون کە حاڵەتێکی ناجۆر، وەها دۆخێک لە مرۆڤدا دروست دەکات کە بە ئاسانی ئەم بنەما سرووشتیانە تێپەڕێنێت. دەکرێ بڵێین ئەم کردەی تێپەڕاندنە، لە ڕێگەی ڕووبەڕووبەوەی ئەو بنەما نەگۆڕانەی شکست و مەرگەوە دێتە ئارا، کە مرۆڤ دەکرێ خۆی تێیاندا بسەلمێنێت. بێ لەمەش، دەگونجێت مرۆڤ ئەم بڕوابەخۆبوون و سووربوونەوەیەی خۆی لە ئەنجامدانی کارێکدا، لە ڕێی ئەو دژمن و ڕکابەرە لێهاتوو و بەهێزانەوە بسەلمێنێت کە خۆی هەڵیان دەبژێرێت. سانتیاگۆ مارلینەکە بە کەم سەیر ناکات و

شـــیاوی ئەو ململانێـــیەی دەزانێـــت، وەک چـــۆن پێشـــتر ڕەشپێنســـتەکەی کۆنفیگۆســـی بە شـــیاوی ڕووبەڕووبـــوونەوە زانی. ویستی سانتیاگۆ بەرانبەر ڕکابەرەکانی، جۆرێک لە ڕێز و خۆشەویستی دەهێنێتە نێو هاوکێشـەی مەرگ، وەک بڵێیت تێکشاندن و کوشتنی ئەوان دەبێتە شانازی و ڕێزێک بۆ ئەو و، هەستی بالابوون و پالەوانی لە ناخی ئەودا زیاتر چەکەرە دەکـات. دەکـرێ ئەم قسـانە، لەو بـڕگەیەدا لێـک بـدەینەوە کە سـانتیاگۆ دەڵێـت: لەبەر ئەوەی خۆشـم دەوێیـت، پێویسـتە بتکـوژم. لە دوابەدوای ئەمانەشـدا دەکرێـت هـاوتەریبی و هـاوڕاییەک لە شـیعرەکەی *جـۆن کیتـدا* سـەبارەت بەم پرسـە هەبێت، کە پێی وایە ئێمە تەنها لە ساتەکانی پێش مەرگدا لە جـوانی تێدەگەین، ئەو کاتـانەی کە جـوانی خەریـکە مـل بـۆ لەنـاوچوون کەچ دەکـات. سـانتیاگۆش هەرچەنـدە لە کۆتـایی ڕۆمـانەکەدا تێـک دەشـکێت، وەلـێ نابەزێـت، بەڵکـوو بە پـێچەوانەوە، وەک پاڵەوانێـک لەنێـو ئەم ڕووداوانەدا دەربـاز دەبێـت. ئەم ململانێـیە دەبێـتە هۆکـار، تـا سـانتیاگۆ بە چارەنووسی شکۆدار و بەرزی خۆی شاد ببێت.

## شانازی وەک سەرچاوەیەکی مەزنی و هەتەری.

لێکچــوونێکی زۆر هەیە لەنێــوان ســانتیاگۆ و کەســایەتییە کلاسیکییە کۆنەکانی ڕابردوو. ئەم جۆرە پاڵەوانانە لەپێناو نیشاندانی هێزێکی تۆقێنەرانە، ئازایەتی و ئاکاربەرزیدا، زۆر کات بەرەو هەڵدێر دەچن. گەر شانازی خاڵی کۆشندەی سانتیاگۆ بێت، ئەوە خۆی زۆر باش ئاگادارە. پاش ئەوەی قرشەکان ماسییەکە لەتلەت دەکەن، پیرەمێردەکە چەند جارێک داوای بەخشین لە مارلینەکە، هاوڕێ و ڕکابەرە قەدرگرانەکەی دەکات، لەبەر ئەوەی کە زۆر دوور کەوتەوە، سنووری خۆی وەک ماسیگرێک بەزاند و بەوەش ڕەنجی هەردووکیانی بە با دا. بێ گومان ئەم کاردانەوەیەش بە ڕوونی دەردەکەوێت، کاتێک کۆتا قسەی دوای بەزینەکەی ئەمە دەبێت: «هیچ، تەنها زۆر دوور کەوتمەوە و بەس!»

لە کاتێکدا کە هەر بە ڕاستی هەشتاوچوار ڕۆژ گەڕانەوە بە دەستی بەتاڵ لە خۆیدا جۆرێک سووکایەتییە بە شانازی و شکۆی سانتیاگۆ و، هەوڵدانیشی بۆ ئەوەی تواناکانی خۆی بسەلمێنێت و لەوانی دیکە دوور بکەوێتەوە، جگە لەوەی کارەساتێکی لێ کەوتەوە، هیچی دیکەی لێ بەرهەم نەهات. هێمینگوەی لێرەدا کەسایەتییەکەی بە شانازیکردن و بڕوابەخۆبوون تاوانبار ناکات، بە پێچەوانەوە، سانتیاگۆ وەک نموونەیەک وەستاوە، کە سەلمێنەری ئەو ڕاستییەیە، کە شانازی مرۆڤەکان بەرەو مەزنی و پلەیەکی باڵا دەبات. جا لەبەر ئەوەی سانتیاگۆ ئاگادارە کە مارلینە گەورەکەی بەهێزی

بەخۆنازین و بڕوابەخۆبوونەوە کوشت و، کوشتنی ماسییەکەش گەیاندیە بەزینێکی پاڵەوانانە و سەربەرزانە! لێرەدا شانازیکردن و بەخۆنازین دەبنە سەرچاوەی مەزنیی سانتیاگۆ. چونکە بەبێ هەستکردن بە شانازی، بڕوابەخۆبوونێکی لەو جۆرە، هەرگیز سانتیاگۆ نەیدەتوانی لە ململانێیەکی وادا سەرکەوتوو بێت. یانیش بەر لەوەی کۆتایی بێت، کۆڵی دەدا و پاشگەز دەبووەوە.

بەخۆنازینی سانتیاگۆ جگە لەوەی کە وزە و گوڕوتینێکی باشی بە بەردا دەکات، لە لایەکی دیکەشەوە یارمەتیی دەدات کە بەرەنگاری هێزە لەناوبەر و تووشەکانی سرووشت ببێتەوە. بە درێژایی ڕۆمانەکە دەبینین کە گرنگ نییە پیرەمێردەکە چەنێک حاڵی خراپە و دەناڵێنێت، بەردەوام یەک قسە دووپات دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە کە ماسییەکە بکوژێت و بیباتەوە بەندەرەکە. کاتێک یەکەم قرش بەرەو بەلەمەکە هێرش دەهێنێت، بیروڕا و هیوای سانتیاگۆ لەو چەند پەڕەیەدا بە دوو شێوەی جیاواز دەر دەکەوێت. یەکەم، پێمان دەڵێ کە سانتیاگۆ بە تەواوی لەسەر هێز و گوڕوتینی خۆی بوو، بەڵام هیوای کەم بوو. دواتر پێمان دەڵێ کە هیوابڕاوانە قرشەکانی بە هەموو هێزی خۆیەوە دەکوتی! پیرەمێردەکە هەموو ڕکەبەرایەتییەکان بە هەمان ورەی پۆڵاین و بەرزەوە قبوڵ دەکات. سەرەتا لەپێناو کوشتنی مارلینەکە و بەستنەوەی بە بەلەمەکەوە، ئامادەیە بمرێت، دواتریش تا مەرگ سوورە لەسەر ئەوەی شەڕی قرشە چڵێس و برسییەکان بکات. هەر ئەم بڕیارە ئاگایانەی کە هەڵوێستی هەبێت، شەڕ بکات و کۆڵ نەدات، وا لە سانتیاگۆ دەکات کە بەزین تێپەڕێنێت. لەگەڵ

ئەوەشدا کە بە دەستی خالی دەگەڕێتەوە هاڤانا، بەلام لە ناخی دڵیەوە باش دەزانێت کە سەربەرزانە و وەک پیاوێکی بەشکۆ گەڕاوەتەوە. لێرەدا هێمینگوەی دەکرێ مەبەستی ئەوە بێت پێمان بڵێت، کە سەرکەوتن هەموو کات مەرجی بەدەستهێنانی ڕێز و شکۆ نییە لەنێو ئەوانی دیکەدا. سەرکەوتن پشت بە یەک شت دەبەستێت، ئەویش ئەوەیە کەسەکە بڕوای بە خۆی هەبێت و تا دوا ساتی ململانێکە بە ورەیەکی بەرزەوە بمێنێتەوە، بێ گوێدانە ئەو شتانەی کە دێنە ڕێی. تەنانەت گەر بە مارلینێکی ساغیشەوە بگەڕاباوە، ئەوا ساتەوەختی سەرکەوتنەکەی، هەروەک گۆشتی خراپنەکراوی مارلینەکە کورتخایەن دەبوو! ئەو سەرکەوتن و شانازییەی کە سانتیاگۆ دەستی خست، لە خودی ململانێکەوە نایەت، بەڵکوو لە ویستی کۆڵنەدان و بڕابەخۆبوونی خۆیەوە بۆ ململانێ دێت.

## پەیکەری لەخاچدراوی مەسیح

لەپێناو پێدانی مانایەکی قوڵتر بەو قوربانییەی کە سانتیاگۆ دەیدات و ئەو سەرکەوتنەش کە لێوەی سەرچاوە دەگرێت، هێمینگوەی بە قەستی سانتیاگۆ دەچوێنێت بە عیسای مەسیح، کە بەپێی ئایینزانیی مەسیحی، ژیانی خۆی لەپێناو شتێکی گەورەتر کردە قوربانی، کە ئاشتی و دادپەروەریی مرۆڤەکانە. پەیکەری لەخاچدراوی مەسیح، یەکێکە لە دیارترین ئەو ڕێگانەی کە هێمینگوەی دەیەوێت لە ڕێیەوە پەیوەندییەکی ئاماژەئاسا لەنێوان پیرەمێردەکە و مەسیحدا دروست بکات. کاتێک بۆ یەکەم جار پەتەکە لەپێ دەستی پیرەمێردەکە دەبڕێت، خوێنەر خوێنەویستانە بیری بۆ سەر جێبرینەکانی دەستی مەسیح دەچێت کە لە خاچ درابوو. دواتر کاتێک سەروسەکوتی قرشەکان دەردەکەوێت، هێمینگوەی پیرەمێردەکە وەک کەسێکی لەخاچدراو نیشان دەدات، کاتێک دەنگێک دەردەکات، کە وەک گێڕەوەوە پێمان دەڵێت تەنها لەو کاتانەدا مرۆڤ ئەو دەنگە دەردەکات کە بزمارێک بکوترێ بە دەستیدا و لەودیویشەوە تەختەکانی پێوە کون بکرێت. گەر سەرنج بدەین، لە شوێنێکی دیکەشدا و ئەو کاتەی سانتیاگۆ ئەستوون و بایەوانەکەی بە شانیدا داوە و بە گردەکەدا هەڵدەگەڕێت، هەمان دیمەنی مەسیحمان دەهێنێتەوە یاد کە مارشێک بەرەو *کالڤاری* چوو. تەنانەت کۆتا شێوازی خەوتنی سانتیاگۆ کە لەسەر تەختەخەوەکەی وەک دارمەیت ڕاکشاوە و دەستەکانی درێژ کردوون، لەپێ دەستەکانیشی بە ئاراستەی سەرەوە ڕاگرتوون، هەمان دیمەنی مەسیحمان دەهێنێتەوە یاد

که به خاچەکەوە ئازار دەچێژێت. هێمینگوەی کۆی ئەم وێنانە لە کۆتایی رۆمانەکەدا دەخاتە روو، تا کەسایەتیی سانتیاگۆ بە مەسیحەوە گری بدات، کە کەسێک بوو دۆرانی کردە دەستکەوت، بەزینی گۆری بۆ سەرکەوتن، تەنانەت مەرگی خۆیشی کردە هەوێنی ژیانێکی تازە.

# ژیان لە مەرگەوە

مەرگ هێزێکی پشتگوێنەخراو و ئەبەدییە لە ڕۆمانەکەدا، بە جۆرێک کە ئەوە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە هیچ بوونەوەرێک ناتوانێت لێی دەرباز بێت. بەڵام هێمینگوەی پێمان دەڵێ کە مردن لە خۆیدا کۆتایی نییە، چونکە لە مەرگدا هەردەم ئەگەری ژیانێکی نەبڕاوەی لێوڕێژ لە وزە بوونی هەیە. کاتێک پیرەمێرد مارلینەکە دەکوژێت، ئەوە تەنها ئەو نییە کە ناچار بە چالاکبوونەوە و کارکردن دەبێت، بەڵکوو ماسییەکەش، لەگەڵ ئەوەدا کە مردووە، دووبارە ژیانی تێ دەگەڕێتەوە! ژیان و ئەگەری نوێبوونەوە، بێ گومان بە شوێن کۆتا چرکەساتەکانی مەرگدا دێن.

ئەو کتێبانەش کە باس لە مەرگی عیسای مەسیح دەکەن، جەخت لە هەمان پەیوەندیی خێرا و پەیوەستی نێوان ژیان و مەرگ دەکەنەوە، وەک چۆن لە ململانێی نێوان سانتیاگۆ و ماسییەکەشدا دەیبینین. کوشتنی ماسییەکە و سەرکەوتنی لە گرێدانی بە بەلەمەکەوە، سام و ڕێزێکی تازەی لەنێو ماسیگرەکاندا بۆ دەستەبەر دەکات، جگە لە گەڕانەوە و هاودەمیکردنی کوڕێژگەکە، کە وەک بەردەستێک بەردەوامی بە هەمان ڕێچکەی سانتیاگۆ دەدات پاش مەرگیشی. لێرەدا دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی، کە ئەوەی بە لای هێمینگوەییەوە گرنگە، ئەوەیە کە مرۆڤ کارێک بکات لە ژیاندا، کە دوای مەرگیشی هەر سێبەری دەسەڵات و ئەزموونی بەسەر مرۆڤەکانی پاش خۆیەوە بمێنێتەوە. ئەمەش لە ڕێی، کۆڵنەدان

و بەرەنگاربوونەوە، هەوڵدان بۆ گەیشتن بە جەوهەری خودی کەسەکەوە دێت. چونکە مرۆڤ تا خۆی نەدۆزێتەوە، ناتوانێت ئەوانی دیکەش فێر بکات کە خۆیان بدۆزنەوە و، دواجار ئەوە گرنگە کە مرۆڤ، ئەو وزە و توانایەی خۆی هەر وا پووچ و بێمانا ڕادەستی مەرگ نەکات.

## شێرەکانی ڕۆخ زەریا

سانتیاگۆ سێ جار خەونە خۆشەکەی خۆی، کە خەونبینینە بە شێرەکانی ڕۆخ زەریای ئەفریقاوە، دەبینێت. یەکەم جار لە کووخەکەی خۆیدا کە ڕاکشاوە و سێ ڕۆژ بەر لە ململانێکە. دواتر لەنێو بەلەمەکەدا و لە بارێکی ناجۆر و خراپدا خەونیان پێوە دەبینێتەوە. سێیەم جاریش لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا کاتێک بە شەکەتی دەگەڕێتەوە سەر تەختەخەوەکەی و دەخەوێت. بێ گومان، بەڵێنی سەرکەوتن و جۆرێک لە نوێبوونەوە و هەستانەوەی دوای بەزین لە ناوەڕۆکی ڕۆمانەکەدا، بە جۆرێک لە جۆرەکان لە کۆتا دیمەنی شێرەکاندا دەر دەکەوێت. سانتیاگۆ شێرەکانی بە تەمەنی گەنجی خۆیەوە گرێداون، ئەمەش جۆرێک لە سووڕی سرووشتیی ژیانمان نیشان دەدات. جا لەبەر ئەوەی سانتیاگۆ خەون بە شێرەکانەوە، کە گیانداری ڕاوکەر و دڕندەن، دەبینێت کە گەمە دەکەن، ئەوا خەونەکەی جۆرێک لە هارمۆنییەت و خاڵی پێکەوەبەستن لەنێوان هێزە دژ بە یەکەکانی سرووشت دروست دەکات، وەک: ژیان و مەرگ، ڕق و خۆشەویستی، لەناوچوون و نوێبوونەوە.

# هێماکان

## مارلین

ماسییەکی ناوازە، بەهێز و بەشکۆیە. مارلینەکە وەک هێمای ڕکابەرێکی نموونەیی دانراوە. لە جیهانێکدا کە «هەموو شتەکان یەکدی لەناو دەبەن.» سانتیاگۆ هەست دەکات کە کەسێکی زۆر بەبەختە، کە بە ڕکابەرێکی وا بەهێز و بەتواناوە گری دراوە، کە ئەمەش وای لێ دەکات بە کەم سەیری نەکات و هەموو هێز و توانا، خۆشەویستی و ئازایەتیی خۆی لە ململانێکەدا نمایش بکات.

## قرشە قەپۆزخاکەنازییەکان

قرشە قەپۆزخاکەنازییەکان لە چەند بوونەوەرێکی جووڵاوی برسی و چڵێس و هەڵەشە کە هێرش دەکەنە سەر مارلینەکە، زیاترن. وەک چۆن دژمنی پیرەمێردەکەن، بە هەمان شێوەش دژی مارلینەکە، کە گەورەترین دەستکەوتی سانتیاگۆیە، وەستاونەتەوە. ئەم قرشانە نیشاندەری یاسای تێکشکێنەر و وێرانکەری گەردوونن و وەک هێمایەک بۆ بێرەحمیی ژیان و پێشهاتەکان دانراون. هاوکات ئەو ڕاستییە نیشان دەدەن کە ئەم یاسا گەردوونییە بێرەحمانانە، تەنها کاتێک تێدەپەڕێنرێن، کە مرۆڤ تا دوا سات بەرەو ڕوویان بوەستێتەوە و کۆڵ نەدات. جا لەبەر ئەوەی کە قرشەکان، قرشگەلی بەدفەڕ و

دزێـوی هەڵقـولاوی نێـو تـاریکیی سرووشـتن، سـانتیاگۆ بە شەڕکردن لەگەڵیان هیچ سەرکەوتنێک بەدەست ناهێنێت.

شیکاریی ڕۆژەکان

## یەکەم ڕۆژ

یەکەم پەڕەی ڕۆمـانەکە کەسـایەتیی سـانتیاگۆمان بـۆ ئاشـکرا دەکات و دواتر ڕێچکەیەک بۆ ئەو ڕووداوانە دادەنێت کە بە شـوێنیدا دێـن. وێـڕای ئەوەی کە کـوڕیژگەکەی زۆر خـۆش دەوێت و، ئەویـش بە هەمـان شێوە هـۆگری سـانتیاگۆ بـووە، وەلێ دەبینین سانتیاگۆ کەم تا زۆر وەک بێگانەیەک دەژی. ئەو سلاوانەی لە لایەن ماسیگرەکانی دیکەوە بە سـانتیاگۆ دەگەن، بە تایبەت ئەوانەی کە گاڵتەی پێ دەکەن سەبارەت بەو هەمـوو گەشـتە دەریـاییە بێهـوودانەی، ئەوە دەسـەلمێنن کە سـانتیاگۆ کەسـایەتییەکی دوورەپەرێـز و پەراوێزخـراوە. ئەم جـۆرە کەسـایەتیانەش، کە کەسـانی دوورەپەرێـز و نـامۆن، زۆربەی زۆری پاڵەوانەکـانی هێمینگـوەی پێـک دەهێـنن. بە جۆرێـک کە دەکرێ بڵێین گەورەترین سـەرکەوتنیان، پشت بە جیابوونەوە و خـۆبەدوورگرتن لەوانـی دیـکە دەبەسـتێت. لە کارەکـانی هێمینگوەیـدا، هەر ئەوەنـدە تـاک لە ساردوسـڕی، بێهەسـتی و ئامـانجە سـاختەکانی کۆمەڵگەی مۆدێرن دابڕا، ئیدی توانـای تێگەیشـتن و بەرگەگرتنـی زۆرتـرین ئەو ڕاسـتی و حـاڵەتە گەردونیـانە دەگرێت کە دەوریـان داوە. بۆ نمـوونە لە ڕۆمـانی *ماڵئـاوایی لە* چەکدا، کاتیـک *فریـدریک هێنـری* واز لە پـێگە سوپاییەکەی خۆی دەهێنێت و دەچێتە جۆرێک لە خەڵوەت و بارێکی دابڕان لە کۆمەڵگەوە، دووبارە تێدەگات و فێر دەبێت کە مەرگ پەردەی ڕەش و تـاریکی خـۆی بەسـەر پرسـەکانی شانازی و شەرەف و خۆشەویستیدا دەداتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە پەیامی هێمینگوەی لە پیرەمێرد و زەریادا لە زۆر لایەنەوە تـاڵ و تراژیـدییە، بەڵام چیرۆکـی سـانتیاگۆ و خـورانی

ماسییەکەی لە لایەن قرشەکانەوە، ئەندازەی چیرۆکی فریدریک هێنری ناخۆش و تاڵ نییە! بە پێچەوانەی فریدریک، سانتیاگۆ بەهۆی ئاگایی و وشیاری خۆیەوە، نەبەزێنرا. گێڕەرەوە هەر لە سەرەتاوە جەخت لەسەر کۆڵنەدان و گەورەیی سانتیاگۆ دەکاتەوە، کاتێک وەسفی چاوەکانی دەکات کە دوای سێ مانگ لە ڕاوەماسیی بێهوودە، هێشتا «نەبەزیو و شاد» دەیاننواند. هەروەها ئەوەش کە هەرچەندە سانتیاگۆ تێک دەشکێت و ماسییەکەی هەلاهەلا دەکرێت، بەڵام وەک براوەیەک لە ململانێکە دێتە دەرەوە. چونکە بۆ کوڕەکەی باس دەکرد، کە بۆ ئەوەی ماسییەکی وا بگرێت، دەبوو دوور لە هەمووان بەرەو پانتایی زەریا بەڕێ بکەوێت.

لەم ڕۆمانەدا، سانتیاگۆ لە سەروو پلەی هەر پاڵەوانێکی دیکەوەیە و مرۆڤێکی بالایە، یانی وەک کەسایەتییەکی ئەفسانەیی وایە. بە کورتی سەر بەو ڕەوتی پاڵەوانانەیە، کە لەپێناو بەدەستهێنانی پێگەیەکی بالادا، بە پێویستی دەزانن کە لە خەڵکی ئاسایی دابڕێن و بە جددی لە بابەتێکدا هەموو وزە و گوڕوتینی خۆیان بخەنە گەڕ. جا لەبەر ئەوەی مانۆلین یارمەتی و ڕێز و متمانەی خۆی بۆ سانتیاگۆ نیشان دەدات، ئەمە وا دەکات کە مامۆستاکەی وەک نموونەی مرۆڤێکی بالا و لێزان دەر بکەوێت، وێرای ئەو هەموو سەختی و ئاستەنگییەی هەشتاوچوار ڕۆژی ڕابردووی. لە کاتێکدا کە ماسیگرەکانی دیکە فشەیان بە سانتیاگۆ دێت و گاڵتەی پێ دەکەن، مانۆلین دەرک بە بەهای ڕاستەقینەی سانتیاگۆ و ڕادەی شارەزایی ئەو سەبارەت بە زەریا و ژینگەی دەوروبەر دەکات. لە پیرەمێرد و زەریادا، هێمینگوەی نموونەی کەسێکی باش و سادە بۆ

خوێنەر دەخاتە ڕوو. سانتیاگۆ نەهامەتی و گرفتەکانی جیهان - برسێتی، هەژاری، ڕسوایی- لەڕێی بەرگەگرتن و پشوودرێژییەوە تێدەپەڕێنێت.

لەم چەند دیمەنەی سەرەتادا، هێمینگوەی چەن کێشە و گرفتێک دەخاتە ڕوو کە بە درێژایی چیرۆکەکە دووبارە دەبنەوە. یەکەم، پرسیارکردنە دەربارەی پشوودرێژیی سانتیاگۆ. وەسفی کووخە کۆنەکەی، کەم تا زۆر حەزنەکردن بە خواردنی هیچ شتێک، جەستە لەڕ و لاوازەکەی وا لە خوێنەر دەکەن کە توانایی جەستەیی سانتیاگۆ بخاتە ژێر پرسیارەوە. سانتیاگۆ چۆن دەتوانێت بەرگەی ململانێیەکی سەختی وا بگرێت لەگەڵ مارلینەکەدا، لە کاتێکدا کە ژیانی بە ئەستەم و لەڕێی خاوەنی قاوەخانەیەکی بەخشندەوە دەگوزەرێنێت؟ هەر بە دەستپێکردنی ڕۆمانەکە، ئیدی ئەم پرسیارە بە پرسیارێکی ناپەیوەست دێتە بەرچاو! چونکە ململانێکەی سانتیاگۆ چەنێک جەستەیی و پەیوەست بە هێز و تواناوە بێت، دوو ئەوەندە پەیوەستە بە باری ڕۆحی سانتیاگۆوە!

هەر لەم بەشەدا، ئێمە دوو هێمای گرنگمان لا ڕوون دەبنەوە: شێرەکان کە لە ڕۆخ زەریادا گەمە دەکەن، هەروەها دی ماگیۆی مەزن، یاریزانی بەیسبۆڵی ئەمریکی. بۆ سانتیاگۆ، دی ماگیۆ وەک نموونەیەکی سەرکەوتووی ژیان وایە. سەرەڕای ئەوەی کە تووشی نەخۆشیی دەرپەڕۆقینی ئێسک بووە لە پاژنەی پێیدا، بەڵام نەخۆشییەکە ڕێگر نەبووە و دی ماگیۆ دووبارە گەڕاوەتەوە مەیدانی یارییەکانی بەیسبۆڵ، تا وەک هەندێک دەڵێن، ببێت بە باشترین یاریزانی مێژوو. شێرەکان تا

ڕادەیەک ئاماژەیەکی نادیار و تەماوین! گێڕەرەوە پێمان دەڵێت کە شێرەکان، تاکە خەونێکن کە لەگەڵ سانتیاگۆدا ماونەتەوە. کاتێک دەخەوێت، خەون بە گێژەڵووکە و ئافرەت و ماسییەکانەوە نابینێت، بەڵکوو تەنها خەون بەو شێرانەوە دەبینێت کە لە ڕۆخ زەریادا گەمە دەکەن و زۆری خۆش دەوێن وەک چۆن کوڕێژگەکەشی خۆش دەوێت. جا چونکە وێنە و دیمەنی ئەم شێرانە هەر لە گەنجییەتی سانتیاگۆوە تا پیریی ماونەتەوە، کۆتایی ئەزموون و تەمەنی سانتیاگۆ بە سەرەتایەوە گرێ دەدەن و جۆرە سووڕێکی بازنەیی دەبەخشنە بوونی سانتیاگۆوە. شێرەکانیش وەک سانتیاگۆ بە سرووشتی خۆیان ڕاوچین. جا ڕاستیی ئەوەی کە سانتیاگۆ زیاتر لە کاتی گەمەکردندا شێرەکان دەبینێت نەک ڕاوکردن، ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەم خەونانە بۆ ئەو وەک وچانێک وان- هەڵبەتە وچانێکی کورت- تا کەمێک لە چنگی بارودۆخی سەختی ژیان ڕزگاری ببێت.

## دووەم ڕۆژ

هەر کە سانتیاگۆ پێ دەنێتە ڕۆژی هەشتاوپێنجەمین، خوێنەر لای ڕوون دەبێتەوە ئەو هۆکارانە چین کە وا دەکەن سانتیاگۆ ئەو ماسییە گەورەیە ڕاو بکات. پیرەمێردەکە دەریاوان و ڕاوچییەکی تەواو شارەزایە و لە توانایدا هەیە ئاماژەکان لە زەوی و ئاسمان و گیانەوەرەکاندا بخوێنێتەوە، وەک ئەوەی کتێبێک هەموو ئەو شتانەی پێ بڵێت کە پێویستیەتی. باڵندەماسییەکان، هەمیشە ئاماژەیەکن بۆ نزیکبوونەوە و

دەرکەوتنـی دۆلفینەکـان، ئەمە لە کاتێکدا کە بەپێی ئەزمـوونی سـانتیاگۆ، ڕاتەکانـدێکی تونـد و خێـرای پەتەکە، تەنهـا و تەنهـا ئاماژە بە یەک شت دەدات، ئەویش: مارلینە. ماسییەکی گەورە، کە دەکرێ کێشەکەی زیاد لە سەد پاوەند بێت. بە پێچەوانەی ماسیگرەکانی دیکەوە، سانتیاگۆ بەرەو ئاوە قوڵەکانی گوڵف ستریم بەلەمەکەی دەئاژوێت و بڕوای بە وردی و جدییەتێکی تەواو هەیە لە کارەکانیدا. پەتەکانی ڕێک و ڕاست لەو ئاستەدا کە خۆی دەیەوێت، ڕادەگرێت، نەک وەک ماسیگرەکانی دیکە، کە ڕێگە دەدەن شەپۆلەکان یاری بە پەتەکانیان بکەن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە سانتیاگۆ هەردەم دەزانێت کە پەتەکانی لە مەودایەکـی قولاییـدان. وردی و لێزانیـی سـانتیاگۆ، لەگەڵ توانـای ڕووبەڕووبـوونەوەی ئاسـتەنگییەکان و کـارامەیی لە ڕاپەڕاندنی یەک بە یەکی کارەکانیدا، سانتیاگۆ وەک پاڵەوانێک دەردەخەن. سانتیاگۆ لە دوو لایەنەوە، دەچێتەوە سەر پاڵەوانە کلاسـیکییەکان. یەکەم: شـێوازێکی دەگـمەن و سـەیر نیشـان دەدات لە تێگەیشتنی گەردوندا، وەک چۆن بە خۆی دەڵێت کە زەریا جوان و بەخشندەیە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دڕندەیە. بە جۆرێـک کە ئەو باڵنـدە بچـووک و ناسـکانەی کە بەسـەر ئاوەکەیدا دەفڕن و چاوەڕێی بەخشندەیی لێ دەکەن، زۆر لەوە سیسـەڵە و بێدەسـەڵاتترن کە بەرگەی زەریـا بگرن. دووەم: بە هۆی شانازیکردن بە خۆیەوە، بەرەو هەڵدێر دەچێت. شانازی، سـانتیاگۆ بەرەو جێیەکـی دوور دەبـات، تەنهـا بە شـێوەیەکی خوازەیی نا، بەڵکو کردەییش. وەک هەر پێشهات و ڕووداوێکی گرنگـی کلاسـیکی، گرنگتـرین ڕووداو و ململانێـی نێـو ڕۆمانەکەش بۆ هێمینگوەی، ململانێی مرۆڤێکە. ماسییەکەش بە

پلەی دووەم، چونکە بۆ سانتیاگۆ وەک کۆتەڵێکی سەرکەوتن و دەستکەوتێکی ماددی وایە.

گەلێک ڕەخنە سەبارەت بە شێوازی گێڕانەوەی کتێبەکە، ڕووبەڕووی هێمینگوەی کرانەوە، گوایە لەو ڕێباز و ڕێچکەیە لای داوە کە نووسەر خۆی بانگەشەی بۆ کردووە. هێمینگوەی بە پلەی سەرەکی، یەکەمین گەشەپێدەری ڕێبازی ڕیالیزم بووە. هەردەم ئاواتەخواز بوو کە ئەدەب لەو ڕووە ڕووکەشی و ڕازێندراوەیەی خۆی داماڵرێت و خۆیشی زیاتر وەک ڕۆژنامەنووسێکی نووسەر ناوی دەرکرد، کە لە هەر کەسێکی دیکە زیاتر لە نووسینەکانیدا ڕاستی سەبارەت بە ژیان و واقیعی کەسایەتییەکانی خستووەتە ڕوو. بە بەراورد بە وردەکارییەکانی ژیانی ڕۆژانە، پاشخانێکی میتافیزیکی و فەلسەفەیەکی باڵا لەپشت نووسینەکانی هێمینگوەیەوە دەبینین. وەک چۆن لە *ماڵئاوایی لە چەکدا* دەڵێت: «وشەگەلی ڕووت و ناکردەیی چەشنی شکۆ و ڕێز و ئازایەتی و پیرۆزڕاگرتن، تەواو شەرمەزارکەرن لە پاڵ ناوی بەرجەستەی گوندەکان، ژمارەی جادەکان، ناوی ڕووبارەکان، ژمارەی ڕێککەوت و کەتیبەکاندا.»

زۆرێک لە ڕەخنەگران پێیان وابوو کە هێمینگوەی خەریکە بەرەو ڕێبازێکی نوێی ئەدەب هەنگاو دەنێت، ڕێبازێک کە لە بەرزترین ئاستی ئاماژە و کورتبڕیدایە. هاوکات هێمینگوەی هاوڕای قسەکانیان نەبوو. چونکە ئەو فەلسەفەیەی کە لەم ڕۆمانەیدا ڕەنگی داوەتەوە، هەمان ئەو فەلسەفەیە کە لە ڕۆمانەکانی دیکەشیدا باڵی کێشاوە بەسەر گشت ڕووداو و کەسایەتییەکاندا، بەلام بە شێوەیەکی جیاوازتر. لە

چاوپێکەوتنێکی ساڵی ١٩٥٨دا، هێمینگوەی سەبارەت بە پیرەمێرد و زەریا دەڵێت: «بە هەرحاڵ، بۆ ئەوەی بابەتی چۆنییەتی نووسینی ڕۆمانەکە تێپەڕێنین، ئەوا دەبێت بڵێم کە بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو بەخت یاوەرم بوو لە گواستنەوەی ئەزموونی سانتیاگۆ. بە جۆرێک کە هیچ کەسێکی دیکە نەیدەتوانی بەو جۆرە بیگوازێتەوە. بەختی من لەوەدا بوو، کە پیرەمێرد و کوڕیژگەیەکی زیندوو و چاکم هەبوون و بەم دواییانەش، نووسەران بە تەواوی لەبیریان کردووە کە شتانێکی لەو جۆرە هەن!»

بۆ هێمینگوەی، سانتیاگۆ و مانۆلین تەنها دوو کەسایەتیی نێو دووتوێی کتێبەکە نەبوون، بەڵکو دوو مرۆڤی ڕاستەقینە و خاوەنئەزموون بوون. بە هەمان شێوەی فریدریک هێنری *ماڵئاوایی لە چەک* و جەیک بارنیسی *خۆریش بە هەمان شێوە هەڵدێت*.

یادگاریی پیرەمێردەکە لە ڕاوکردنی مارلینێکی مێیینە، لە نێر و مێیەک، تێڕوانین و دنیابینیی هێمینگوەیمان سەبارەت بە ئافرەت نیشان دەدات، کە لەم جیهانەدا پێگەیەکی وای نییە کە باس بکرێت- وەک چۆن دەبینین کە سانتیاگۆ وێنەی هاوسەرەکەی بە دیوارەکەوە لێ دەکاتەوە. هەر لەم سۆنگەیەشەوە، دەکرێ بگوترێ کە پیاوان کرۆکی کارەکانی هێمینگوەین، بە تایبەت پیرەمێرد و زەریا.

خۆ هەروا گاڵتە و بە هەڵکەوت نییە کە سانتیاگۆ دوای سەرنجدانێکی ورد، بە جۆرێک لە جۆرەکان بڕوای بە خۆی

هێنابوو کە دژمنەکەی، مارلینێکی نێرە! ڕاستییەکەی هەرگیز نەدەکرا بەر لە بینینی ماسییەکە بەو جۆرە دڵنیا بێت!

## سێیەم ڕۆژ

گێڕەرەوەی ڕۆمانەکە پێمان دەڵێ کە سانتیاگۆ باسی ئەو هەڵۆ دڕانە ناکات کە چاوەڕێی باڵندە چکۆلەکەن، چونکە پێی وایە کە خۆی بەو زوانە بەشی خۆی وانەیان لە بارەوە فێر دەبێت. هێمینگوەی لێرەدا زیاتر جەخت دەخاتە سەر سەرنجی سانتیاگۆ لەسەر باڵندە و هەستکردن بەو پەیوەندییە قوڵەی کە لەگەڵیدا هەیە. پێمان دەڵێ کە هەرچەندە جیهان بە جۆرێک نەخشێنراوە کە هەمیشە مەرگمان ڕووبەڕوو دەکاتەوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا تۆڕێکی فراوانی گرێدراوە بە ژیانەوە. بە کورتی هەستکردن بە شەکەتی لە لایەن باڵندەکەوە و چارەنووسی- کە بوونە نێچیری هەڵۆکانە- هەمان ڕەنگدانەوە و نواندنی ماندوویەتی و خورانی ماسییەکەی سانتیاگۆ لە لایەن قرشەکانەوە. واتە لەڕێی باڵندەکەوە پێشوەختە ئێمە سەرەداوێکمان دەست دەکەوێت.

پەیوەندیی سانتیاگۆ بە ژیانی دەرەوە، لەو کاتەدا لەڕێی ئەو باڵندە چکۆلەیەوە ڕوون دەبێتەوە. پیرەمێردەکە هەست بە پەیوەندییەکی بەتین و گیانیبەگیانی دەکات لەگەڵ ماسییەکەدا، زەریا و ئەستێرەکان و هەموو جارێکیش خۆشەویستی و ڕێزی خۆی بۆ مارلینەکە دووپات دەکاتەوە. هەر لەبەر ئەم هۆکارەشە کە مردنی ماسییەکە، تا ئەو ڕادەیەش تراژیدی و بێڕەحمانە نییە! لە دیدی سانتیاگۆوە و ڕوونتر بڵێین

هێمینگوەی، مادام مردن بوونێکی حەتمییە و بەرۆکی هەمووان دەگرێت، باشترە لەسەر دەستی ڕکابەر و دژمنێکی لێوەشاوە و بەهێزەوە بێت.

لێهاتوویی و کەسایەتیی بەهێز و بەتوانا، هەمیشە جێی سەرنجی هێمینگوەی بوون، هەر بۆیەش دەبینین کە کتێبەکانی هەمیشە پڕ لە کەسایەتی، ماسیگر، ڕاوچی- نێچیری گەورە، سەرباز، گاباز، یاریزانی بۆکسێنن. ئەدەبی هێمینگوەی جیهانێکمان بۆ دروست دەکات کە کەم تا زۆر دەکرێت بڵێین بە نێرینە تەنراوە، ئەو پیاوانەی کە لەڕێی لێهاتووی و توانای خۆیانەوە، ژیان و پێگەیەکی سەرکەوتوو و شەرەفمەندانەیان لە ژیندا دەستەبەر کردووە. لە ئەدەبی هێمینگوەیدا، دەربازبوون و ژیانگوزەراندن بە کولەمەرگی بەس نییە. بەڵکو لەپێناو تێپەڕاندنی ناخۆشی و کێشەکاندا، پێویستە تاک بە تەواوی شارەزای ئەو یاسا و دابونەریتانە بێت کە لەو کۆمەڵگەیەدا بە پشتبەستن پێیان هەڵدەسەنگێنرێت. هەر بۆیە بەردەوام و هەموو جارێک دەبینین سانتیاگو نمایشی ئەو نەریت و شێوازە سەرکەوتووانەی خۆی دەکات کە وای لێ دەکەن ببێتە مامۆستای خێڵەکەی خۆی! ئەوە سانتیاگۆیە، کە پەتەکانی لە شەپۆلەکاندا لار نابنەوە و تەنها ئەویشە کە جیاواز لەوانی دیکە دوور دوور بەرەو پانتایی زەریا بەلەمەکەی دەئاژوێت.

یاسا و دابونەریتەکان سەراپای ژیانی پیرەمێردەکەیان داگیر کردووە. ئەو کاتانەی بیر لە ماسیگرتن ناکاتەوە، بیری دەچێتە سەر ئایین و بەیسبۆل. جا لەبەر ئەوەی وەک خۆی ئاماژەی پێ دەکات، کەسێکی دیندار نییە، نزاکانی بۆ مریەمی پاکیزە

زیاتر وەک پارانەوە و پەنابردنێک بۆ ئەو هێزە سەروسرووشتییە خوداییەیە و خوونێکی ڕۆژانە کە ورە و هیوای پێ دەبەخشن دەردەکەون. بە هەمان شێوەش، پەرستنی دی ماگیۆی مەزن لە لایەن سانتیاگووە کەم تا زۆر وەک خودایەک و، بەراوردکردنی بەردەوامی خۆی بە ئەو، ئەو خۆپەسەندییەی خۆیمان نیشان دەدات کە پیاوان لە کۆمەڵگەیەکدا، لەسەر چەند بنەما و کولتوور و نەریتێک هەڵدەسەنگێنرێن. دی ماگیۆی مەزن بە هاویشتنی تۆپ بۆ دوورترین مەودا ناوبانگی دەرکردووە، وەک چۆن سانتیاگۆش بە ڕاوکردنی ماسییەکی چل پێ درێژ ناوبانگ دەر دەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا کە سانتیاگۆ خۆی بە کەسیکی دیندار دانانێت، ڕۆمانەکە لە قۆناغەکانی ململانێ و گەرمەی بەرمنگاربوونەوەدا وەک چیرۆکێکی مەسیحیانەی لێ دێت و تا ململانێکەی سەختر دەبێت، سانتیاگۆ زیاتر دەچێتەوە سەر مەسیح. هێمینگوەیش ئەم کاریگارییە لەسەر دوو بنەما دادەنێت، یەکەم پشتبەستن بە هێز، دووەم ئەو هێما و ئاماژانەی کە خوێنەر لە ژیان و مەرگی مەسیحدا پێیان ئاشنا بووە. جێبرینەکانی نێو لەپی دەستی سانتیاگۆ، هەمان جێزماری نێو لەپی دەستی مەسیحن و کاتی لەخاچدانەکەی وەبیر خوێنەر دەهێننەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، دوورەپەرێزی و دابڕانی سانتیاگۆ لەوانی دیکە، هەمان بارودۆخی مەسیحە کە بۆ ماوەی چل ڕۆژ وێڵی دەشتودەر دەبێت. بە ئاژوژتنی بەلەمەکەشی بەرەو دوورترین شوێنی زەریا، سانتیاگۆ لەژێر باڵ و سنووری کۆمەڵگەی خۆیدا دەچێتە دەر.

هێمینگوەی لەڕێی بەردەوام دووبارەکردنەوەی دەربڕینەکانی پیرەمێردەکە سەبارەت بە برایەتیی خۆی و مارلینەکە، هەردووکیان پێکەوە گرێ دەدات و ئاماژە بەوە دەکات کە چارەنووسی هەر یەکێکیان، چارەنووسی ئەوی دیکەشیانە. ئەمەش وا دەکات کە لە یەک کاتدا، هەم وەک دژمن، هەم وەک برای یەکتری دەر بکەون. لەڕێی ئەو دەربڕینەشەوە کە سانتیاگۆ هاوار دەکات: « ئاخر یا مەسیح! من نەمدەزانی بەو رادەیە گەورەیە. لەگەڵ ئەوەشدا، بەو هەموو مەزنی و جوامێرییەشیەوە، هەر بۆڕی دەدەم.» هێمینگوەی وەک چۆن سانتیاگۆ بە مەسیحەوە دەبەستێتەوە، بە هەمان شێوەش مارلینەکە.

دەربڕینی «مەسیح!» بە هاوارێک و بڕگەی «بەو هەموو مەزنی و جوامێرییەشیەوە» بە دەنگی بەرز، چارەنووسی ماسییەکە بە مەسیحەوە گرێ دەدات. ئیدی مادام سانتیاگۆ ماسییەکە بە برای خۆی دەزانێت، بەو جۆرە هەمان چارەنووسی یەکتریش هاوبەشی پێ دەکەن. دواتر کاتێک قرشەکان هێرش دەکەنە سەر کەلاکی ماسییەکە، هێرشیش دەکەنە سەر سانتیاگۆ بە هەمان شێوە! لەم نێوەندەشدا هەستی برایەتی و هاودەمیی نێوان سانتیاگۆ و ماسییەکە زێدە روون دەردەکەوێت.

## چوارەم ڕۆژ

کۆتا قۆناغی ململانێکە دوو پرسیاری گرنگ سەبارەت بە رەوت و ڕووداوەکانی پێشووی ڕۆمانەکە دەخاتە بەر باس.

یەکەم، بیرکـــردنەوەیە لە شـــوێن و پـــێگەی مـــرۆڤ لەنێـــو سرووشـــتدا. دووەم، خـــودی سرووشـــت. دەکـــرێ گەشـــتەکەی سانتیاگۆ، بە چیرۆکێکی ئاگاییانەی فرەبابەت لێک بدەینەوە، کە تێیـــدا ئەو وانە دڵتەزێنانەمـــان لا ڕوون دەبـــنەوە، کە فێریـــان دەبین کاتێک دەبینین مرۆڤێک سنوور دەبەزێنێت و بەهـۆی شـــانازی و بڕوابەخۆبـــوونی خـــۆیەوە لە جـــێگەی شـــیاو و ڕاســـتەقینەی خـــۆی لە جیهانـــدا لا دەدات و دوور دەکەوێـــتەوە. هەڵبەت ئەم لێکدانەوەیە، لێکدانەوەیەکی پڕ بە پێست نییە و لاوازە، چـــونکە ســـانتیاگۆ بە سەرکێشـــیکردن و ڕۆیشـــتن بەرەو جێگەیەکی دوور، دەگاتە ئەو شـوێنەی کە توانـای ڕاسـتەقینەی خـــۆی تێـــدا دەدۆزێـــتەوە و دەتـــوانێ بەبـــێ خۆشـــاردنەوە و ڕواڵەتبـــازی، ببێـــتەوە بە خـــودی خـــۆی! بـــێ گومـــان ســـانتیاگۆ جـــێگەی ڕاســـــتەقینەی خـــــۆی جـــێ نەهێشـــت، بەڵکـــوو بە پێچەوانەوە، دۆزییەوە. لێرەدا لامان ڕوون دەبێتەوە کە دەکرێ مرۆڤ لەڕێی گەڕانەوە بۆ نێو سرووشت، بەهـای ڕاسـتەقینەی خـــۆی بـــدۆزێتەوە. چـــونکە مـــرۆڤ بەردەوام لە لایەن کـــاڵا و جـــوولانەوە تازەکـــانەوە بەنـــد کـــراوە و گەمەی دەســـتی ئارەزووەکـانی ئەو جیهـانە مـۆدێرنەیە کە مرۆڤەکـان بەڕێـوە دەبات.

لە قۆناغێکـدا ســانتیاگۆ بــرەو بە پەیوەنـدی و برایەتیـی نێـوان خـۆی و ماسـییەکە دەدات و دەڵـێ: «ئەی ماسـییەکە، خەریـکە دەمکـوژی و بـۆ ئەمەش ناهەقـت نـاگرم، چـونکە بە تەمەنـم بوونەوەرێکی هێندەی تۆ نازدار، قەشـەنگ، جوامێر و گەورە و ئۆقرەگرم نەدیوە براله گیان. دەی بمکوژە! ئیـدی بـاکم بەوە نیـیە کـێ کـێ دەکـوژێ.» ئەم جـۆرە بیرکـردنەوەیە، فیکـری

هێمینگوەی و پەیامی ڕۆمانەکەمان سەبارەت بە سرووشت لا ڕوون دەکاتەوە. کاتێک سانتیاگۆ بە تەواوی شەکەت بووە و ململانێکەی وەختە کۆتایی بێت، تێدەگات کە لە جیهانێکدایە مەرگ و ژیان دەست لەناو دەست، وەک دوو دڵداری لێکگرێدراون. هەموو بوونەوەرێک دواجار دەمرێت، بەڵام بە ڕای سانتیاگۆ تەنها برایەتی و پەیوەندیی نێوان مرۆڤ بە سرووشت و گیاندارەکانی دەوروبەریەوە دەتوانێ کەمێ ئەو ناشیرینییەمان لا جوان بکات! مردنی مارلینەکە، لە خۆیدا پرسێکی سەربەخۆی جوانییە. چونکە مردن ماسییەکە دەگۆڕێت بە ئامرازێکی گەورەتر، شتێک کە لێوانلێوە لە ژیان. وەک چۆن لە ڕۆمانەکەدا دەڵێت: «دواتر ماسییەکە بە مردوویی، ژیانی تێ گەڕایەوە!» سەبارەت بە سرووشتی ژیان، هێمینگوەی لای وایە کە جوانی کوشندەیە، تەمەن هێزە و مەرگیش گەورەترین حاڵەتی زیندوبوون و ژیانە!

ئەو گۆڕانکاریانەی کە ماسییەکە دوای مردنی پێیاندا تێدەپەڕێت، هەمان ئەو گۆڕانکاریانە نیشان دەدات کە لەدوا پەڕەکانی ڕۆمانەکەدا چاوەڕێی سانتیاگۆن. ململانێی پیرەمێرد لەگەڵ ماسییەکەدا، بە ئەشکەنجە و ئازاری نەبڕاوە جۆش دراوە. بەڵام پیرەمێردەکە لە جیهانێکدا دەژی کە دەکرێ زۆر ئازارچەشتن سەرچاوەی سەرکەوتن بێت نەک دۆڕان. نهێنیی سەرکەوتنی سانتیاگۆ، وەک چۆن لە کۆتا ڕستەکانی ڕۆمانەکەدا لامان ڕوون دەبێتەوە، کۆڵنەدان و بەرگەگرتنە مەسیحئاساکەیەتی و ئەو شتانەشی کە بە ڕاستی لە گرنگی و بەهای ڕاستەقینەیان تێگەیشتووە. سانتیاگۆ بەردەوام بیر خۆی دەهێنێتەوە کە ئازاری جەستەیی شتێکە کە نابێ پیاو گوێی پێ

بدات، بەردەوام جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە مێشکی بە سافی بهێڵێتەوە و وەک پیاوێکی ڕاستەقینە، بەرگەی ئازار و چەرمەسەرییەکانی بگرێت.

بەلام دوای ئەوەی *قرشە ماکۆکە* بەرەو ڕووی دێت، هیوای سەرکەوتنی پیرەمێردەکە جۆرێک گومانی تێ دەکەوێت. لێرەدا دەکرێ بڵێین کە هیوا و پشوودرێژی، دوانەیەکی لە یەک دانەبڕاون و ڕۆمانەکەش پێشنیاری ئەوە دەکات کە هەر کات هیوا و ئازار بە یەک گەیشتن، ئەوا پشوودرێژی و کۆڵنەدانیش دەدۆزرێنەوە. کاتێک سانتیاگۆ ڕێ دەکات و قرشەکانیش بەردەوام پەلاماری ماسییەکەی دەدەن، گێڕەرەوە دەڵێت: «تەواو چالاک و بەگوڕوتین بوو، وەلێ هیوای کەم بوو.» هەر چەند بڕگەیەک دواتر، گێڕەرەوە دەڵێت: «بە هەموو هێزییەوە قرشەکانی دەکوتین، وەلێ هیوابڕاوانە.» بەلام گەر هیوا نەبووایە، ئەوا سانتیاگۆ هیچ هۆکارێکی نەبوو تا شەڕی قرشەکان بکات و بگەڕێتەوە ماڵ!

هەر بۆیە، سانتیاگۆ زوو دەرک بەوە دەکات کە گەمژەییە مرۆڤ هیوا لەدەست بدات، هاوکات دووڕۆیشتنی خۆیشی بە تاوان لە قەڵەم دەدات. دواجار سانتیاگۆ لەڕێی کۆڵنەدانەوە، بەسەر قرشەکەدا زاڵ دەبێت. *ئیلمەر شوارزی* شاعیر *پیرەمێرد و زەریا* وەک بەرەوپێشچوونێکی دراماتیکیانەی کایەی نووسینی هێمینگوەی دەبینێت، چونکە «هیوای ئاگاییان»ـەی سانتیاگۆ، جۆرێک لە یەکانگیری، لەنێوان گوڕوتینی لاویی خۆی و شەکەتی و ماندوویەتیی پیریدا دروست دەکات. بەر لەم ڕۆمانە، هێمینگوەی دوو جۆر پاڵەوانی لە کتێبەکانیدا دەئافراندن. یەکەم، پاڵەوانی هاوچەشنی

نیکی ئادەمی «کامپی هیندی» کە سیخناخە لە گومان و وەهم. دووەم، کەسایەتی وەک فریدریک هێنری «ماڵئاوایی لە چەک» کە بەهۆی ئاگایی و وشیاریی خۆیەوە سەبارەت بە جیهان و دەوروبەری، تێک شکاوە.

## پێنجەم ڕۆژ

بە ڕوانین لە حاڵەتی قوڵی تراژیدیی سانتیاگۆ، تێدەگەین کە دەگمەنە سانتیاگۆ هەلێکی دیکەی لەو چەشنەی بۆ بڕەخسێتەوە، تا ماسییەکی لەو جۆرە ڕاو بکات. سانتیاگۆ دووبارە لەگەڵ مانۆلیندا یەک دەگرێتەوە، کە بێئۆقرانە چاوەڕوانیی دەکات تا مەشقەکانی کۆتاییان بێت. هەموو ئەو ئاکار و خووە باڵا و جوامێرانانە و گرنگتر لەوانیش، ئەو وانانەی کە لە ئەزموونەکانی خۆیەوە فێریان بووە، بۆ کوڕەکە دەگوازرێنەوە. بەم جۆرەش، ماسیگرەکەی ئێمە، سانتیاگۆ، بە جۆرێک لە جۆرەکان پاش مردنیشی هەر بە زیندوویەتی دەمێنێتەوە! بەڵێنی سەرکەوتن و نوێبوونەوە، لەڕێی وێنەی داخراوی ڕۆمانەکەوە پاساو دراوە. بۆ جاری سێیەم سانتیاگۆ خەون بە شێرەکانی کەنار زەریای ئەفریقاوە دەبینێت. ئەم شێرانە سەردەمی لاوێتی بیر سانتیاگۆ دەهێننەوە و هاوکات هارمۆنییەتێکیش لەنێوان هێزە دژ بە یەکەکانی سرووشتدا دروست دەکەن. ئەو هیوایەی کە سانتیاگۆ لە کۆتا لاپەڕەکانی ڕۆمانەکەدا هەیەتی، هیوایەک نییە کە لە سادەییەوە سەرچاوەی گرتبێت، بەڵکوو هیوایەکە لە ئەزموونێکی تازەوە، کە بەرئەنجامی ڕووداوێکی کۆنە، دەستەبەر بووە! وەک

قەقنەسێک کە دووبارە لە خۆڵەمێشی سووتاوی خۆیدا زیندوو دەبێتەوە. پەیامی ڕۆمانەکە ڕوونتر دێتە پێشچاو، کاتێک سانتیاگۆ پێمان دەڵێت: «مرۆڤ دەکرێ تێک بشکێت، وەلێ هەرگیز نابەزێت.» هەلاهەلاکردن و خورانی مارلینەکە مانای بەزینی سانتیاگۆ نییە، بە پێچەوانەوە ئەم دۆخەوە، سانتیاگۆ ڕزگار دەکات. بێ گومان پاش ئەم ڕووداوانە، ئەو ماسیگرانەی کە بە سانتیاگۆیان ڕادەبوارد، ئێستە ترسێکیان بەرانبەری هەیە. لاری لەوەدا نییە کە لەدەستدانی ماسییەکە، شکستێکی گەورەیە و قرشەکان شکۆ و مەزنیی سانتیاگۆ دادەماڵن، وەک چۆن ماسییەکە لە پێستی خۆی دادەماڵن و حەپەلووشی دەکەن. بەڵام هێرشی قرشەکان و پەلاماردانی ماسییەکە، تەنها نیوەی وێنەکەیە و کۆی بابەتەکە نییە. کاتێک سانتیاگۆ دەڵێت: «ماسیگرتن چەندە لە ژیاندا دەمهێڵێتەوە، ئەونەش دەمکوژێ»، ئاماژە بەو گرژی و ناکۆکییە دەدات کە لەنێوان لەدەستدان و بەدەستهێنان، بەزین و سەرکەوتن، ژیان و مەرگدا هەیە.

## شێوازی نووسینی هێمینگوەی

لە دواهەمین خوێندنەوەکانی سەدەی بیستدا سەبارەت بە ڕۆمانی پیرەمێرد و زەریا، کە لە لایەن *مالکۆلم کۆلییەوە* کرا، مالکۆلم سەرنجی دا کە هێمینگوەی کۆنترین و کورتترین وشەی بەکارهێناوە، لەگەڵ ئاسانترین داڕشتن. وەک ئەوەی زمانی ئینگلیزی زمانێکی نامۆ بێت و ئەم هاتبێت دایهێنابێت یان دۆزیبێتییەوە بۆ خۆی و، هەوڵی دابێت تەواو پەتی و پوخت لەو زمانەدا بنووسێت. بە دڵنیاییەوە، هێمینگوەی لە خۆیدا نووسەرێکی شۆڕشگێڕ بوو. بە دوای نووسەرانی وەک *هێنری جەیمس* و لەویش کۆنتر *هێرمان مێڤڵدا* هات، بەڵام بەراود بەوان هێمینگوەی وەک نووسەری «چیرۆکی ماسیگران» تەواو خوێنەرانی سەرسام کرد. لە کاتێکدا ڕۆماننووسەکانی پێش خۆی هەوڵیان دەدا، بە داڕشتن و ڕستەسازییەکی تەواو ئاڵۆز هەندێک پرسی کۆمەڵایەتی و وجوودی بخەنە ڕوو، هێمینگوەی دڵنیا بوو کە بەو زمانەی ڕۆژانە قسەی پێ دەکات، دەتوانێت هەمان کار بکات.

هێمینگوەی شانازیی بەو شێواز و فەلسەفە تایبەتەی خۆیەوە دەکرد، سەبارەت بە نووسین، کە پێی دەگوترێت «بنەمای بەستەڵەک». لە ساڵی ١٩٥٨ لە چاوپێکەوتنێکدا لە پاریس، هێمینگوەی بەم جۆرە باسی لە شێوازی نووسینی خۆی کرد:

من هەمیشە هەوڵ دەدەم بە شێوازی *بنەمای بەستەڵەک* بنووسم. هەر بەشێک کە دیارە و ڕوونە لای خوێنەر، حەوت لەسەر هەشتی لەژێر ئاودایە! هەر شتێکت بوێ دەتوانیت لای

ببەیت و ئەمەش تەنها بەستەڵەکەکەی خۆت بەهێز دەکات و دەبێتە بەشی ونبوو. خۆ ئەگەر نووسەر ڕووداو یان کەسایەتییەک لە چیرۆکەکەدا لا ببات بەهۆی ئەوەی کە زانیاریی لەسەر نەبووە، ئەوا کەلێنێک لە چیرۆکەکەدا دروست دەبێت.

هەندێک جار خوێنەر لەژێر چەند وشەیەکی کەمی هێمینگوەیدا، هەست بە هەبوونی مانایەکی ناڕوون و قوڵ دەکات. یادگاریی جوان و وردی سانتیاگۆ سەبارەت بە شێرەکانی قەراخ زەریا، جیهان و کاتێکی جیاوازمان نیشان دەدەن. لە کاتێکدا ئەو هەڵسوکەوت و قسە چاوەڕوانینەکراوانەی کە سانتیاگۆ دەیانکات وەک: «بەس نییە ناچار نیین ئەستێرەکان بکوژین!» ئاماژە بە ژیانێکی پەنهان و نهێنی دەکەن لە ناخیدا، کە خوێنەر تەنها کەمێکی لەبارەوە دەزانێت و ئاماژەیەکی وا گرنگ و زەقی دەست نەکەوتووە، تا بە تەواوی لای ڕوون بێتەوە. جاروبار شێوازی نووسینی هێمینگوەی، زیاتر ڕەنگدانەوەیی دەردەکەوێت، کاتێک دەبینین قسەکانی سانتیاگۆ زیاتر وەک لاساییکردنەوەیەکی خودی هێمینگوەی دەردەکەون، ئەوەک کاریگەرییەکەی ناوەکیی پەیوەست بە بارودۆخ و حاڵەتی خودی سانتیاگۆوە. سەرکۆنەکردن و نەفرەتکردن لە قرشەکانیش، بێ گومان شانازی و بڕوابەخۆبوونێکی پیاوانە و نێرانەی دونیابینیی هێمینگوەیمان نیشان دەدەن کاتێک سانتیاگۆ بە قرشەکە دەڵێت: «میلێک بە قووڵایی ئاوەکەدا بچۆرە خوار و لەوێ بە برادەرەکەت شاد بە، کێ چووزانێ! ڕەنگە دایکت بێ». لەو کتێبانەدا کە پاش خۆی بڵاو کرانەوە، دەکرێت بڵێین کە دیمەن و ساتی لەو جۆرە زۆر دووبارە

دەبنەوە، وەلێ خۆشبەختانە لە پیرەمێرد و زەریادا زۆر کەم دێنە ڕێمان.

سەرچاوە:

Sparknotes, The guide and Analysis of: The Old Man and The Sea

Contributers: Jesse Lichtenstein, David Hopson, Patrick Flanagan, Sarah Friedberg.

پێکـــداچوونی مـــرۆڤ لەگەڵ خۆیـــدا، لە گۆشـــەنیگایەکی بوونگەراییانەوە

## ناساندن

ڕۆمانەکە لە ساڵی ١٩٥٢دا بڵاو کرایەوە و خەڵاتی *پلیتزەری* ئەو ساڵەی وەرگرت و بووە هۆی ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٥٤دا خەڵاتی نۆبل ببەخشرێتە هیمینگوەی. هەڵبەت نکووڵی لەوە ناکرێت کە ئەم ڕۆمانە کاریگەرییەکەی ڕاستەوخۆی لەسەر گەشەسەندنی ئەدەبیاتی مۆدێرنی ئەمریکی هەبوو، بە هۆی ئەو شێوازە کورتبڕ و تۆکمەیەی کە هیمینگوەی لە کتێبەکانیدا بەکاری دەبرد. زۆرێک لە کارەکانی ئێستە بە ئەدەبیاتی کلاسیکی ئەمریکی دادەنرێن.

بوونگەرایی، ڕێبازێکی فیکری فەلسەفییە کە کار لەسەر بوونی مرۆڤ و دۆزینەوەی جەوهەری مرۆڤ دەکات، بە پێچەوانەی ئەو مانا و جەوهەرە تایبەت و ساختانەی کە ئایین و دەسەڵاتەکان دەیدەنە مرۆڤ. لە سەرەتاکانی سەدەی بیست دامەزرێندرا و ڕێبازەکە گەواهیدەری تەنها ئەو جووڵە و پێشکەوتنە تەکنەلۆژی و پیشەسازییانەی ئەوکات نەبوو، بەڵکو ئاگادار بوو لە هۆشیاربوونەوەی بیری خەڵکیش. کاولکارییەکانی جەنگی جیهانیی یەکەم و قەیرانە داراییەکانی ئەو سەردەمە، بیری خەڵکیان بزواند و کەوتنە پرسیارکردن و گومانبردن سەبارەت بە دەسەڵاتەکان. لەم گێرەشێوێنی و کەس‌بەکەسییەدا، مرۆڤ بە دەگمەن بڕوای بە دەسەڵات و یاسا ساختەکانی دارایی دەکرد کە بۆ چەندین سەدە کوێرانە شوێنیان کەوتبوو! هەر بۆیە هەست و بڕوایەکی بەهێزی سەبارەت بە نەپارێزراویی بوونی خۆی لەو سەردەمەدا لا

دروست بووبوو. بەم جۆرەش بوونگەرایی، بەهۆی ئەو تێڕوانینەی خۆیەوە کە پێی وایە قسەکردن و پرسیارکردن سەبارەت بە بوون، تاکە ڕێگەی ڕزگاربوونە لە پووچی و ئازارچەشتن و ترسی مردن، لە دایک بوو. خەڵکی زۆر بە تاسەوەن تا بزانن بە درێژایی ژیانیان و سەروەختی ئەو بڕیارانەی کە لە ڕێی ئەزموون و بەدواداگەڕانەوە دەیدەن، کێن و چین! هەڵبەت بڕیاردانێک کە یاسا و کولتوور و نەژاد دەستی تێ وەرنەدابێت، چونکە هەر یەکێکیان لە گۆشەیەکەوە بەدوای ئازادیی تاکدا وێڵە.

ئەو کاتەی هێمینگوەی خەریکی نووسینی پیرەمێرد و زەریا بوو، دوو هۆکار کاریگەریان لەسەر نووسینی هەبوو. یەکەم، هێمینگوەی کاتێک کە چیرۆکەکەی نووسی، بوونگەرایی لە ترۆپکی گەشەسەندنی خۆیدا بوو. دووەم، لەو کاتانەدا هێمینگوەی بە بارودۆخێکی سەختدا تێدەپەڕی و کەوتبووە سەرنجدان و وروژاندنی پرسی بوونی مرۆڤ. سەرئەنجام، ئەم ڕۆمانەی لێوە بەرهەم هات، کە دەکرێ بڵێین بە فیکر و بنەماکانی بوونگەرایی ڕەنگ کراوە.

## بوون بەر لە جەوهەری مرۆڤەوە دێت

کاتێک فەیلوسفی بوونگەرا *سارتەر* پێمان دەڵێت کە بوون لەپێش جەوهەری مرۆڤەوە دێت، مەبەستی لەوەیە کە بەر لە هەموو شتێک مرۆڤ بوونێکی هەیە، دواتر دەست دەکات بە ژیان و گەڕان بەنێو جیهاندا و لە دوابەدوای ئەمانەشدا بەو جۆرەی کە خۆی دەیخوازێت، پێناسەی خودی خۆی دەکات و شوناسێک دەبەخشێتە خۆی. تا ئەو ساتەی کە بوون و جەوهەری مرۆڤ پرسیار و جێگەی سەرنج بن، ئەوا پرسەکانی «بوون لە خۆیدا- being-in itself» و «بوون بۆ خۆی- being- for itself» دوو کێشە و هاوکات دوو کلیل دەبن کە پێویست دەکات بە وردی بخوێنرێنەوە. سارتەر لە کتێبە کلاسیکییە فەلسەفییەکەی خۆیدا بە ناوی *بوون و نەبوون*، هاوواتایەکی دیکەی بەخشییە چەمکی بوون. بوون لای سارتەر دوو جۆرە: بوون لە خۆیدا و بوون بۆ خۆی. بێ گومان دووەم دانەیان بکەری یەکەم دانەیانە. بوون لە خۆیدا، بوونێکی نائاگاییانەیە، ئەو بوونی دیاردە و لێزانی مەعریفەیەیە کە هەمانە. تا ئەو کاتەی کە مرۆڤ جێی سەرنج بێت، بوون لە خۆیدا، ئاماژە بەو ئەندام و لایەنە دەکات کە مرۆڤەکە پێک دەهێنن، وەک دەموچاو، جەستە، پێست، توانای خوێندن، شێوازەری قسەکردن، توانای جەستەیی و گشت ئەو پاڵنەر و کەرەستانەی کە بەشێکن لە مرۆڤەکە. بوون بۆ خۆی، ئەو بوونەیە کە لە بیر و ئاگاییماندایە، کە دەکری بڵێین لە ئێستادا بوونی نییە و ئەو بوونەیە کە وەک وێنەیەک دامانناوە و دەمانەوێت لە داهاتوودا پێی بگەین و وا دەزانین خودی

خۆمانه! به شێوەیەکی گشتی، بوون له خۆیدا، خودی خۆمانه و بوون بۆ خۆی، ئەوەیە کە هیواخوازین پێی بگەین. به پشتبەستن بەو بوونە خۆییەی کە له مێشکی مرۆڤدا هەیە، ئەو مرۆڤە هاوکات بوون بۆ خۆییەکیشی کە هانی دەدات کار بکات و بەرەوپێش بچێت و له بەرانبەردا یارمەتیی دەدات کە بوون له خۆیدایەکی تازە دروست بکات. لەبری ئەو بوونە سادەیەی، کە مەبەست له خۆیدا هەیەتی، مرۆڤ وەک مەبەستێک بۆ خۆی، دەکەوێتە پێکداچوون و دژ به یەکییەک لەگەڵ خۆیدا، لەڕێی ئەو ململانێ ناوەکییەی کە لەنێوان بوون له خۆیدا و بوون بۆ خۆی دەگوزەرێت.

کاتێک دەڵێین کە بوون لەپێش جەوهەری مرۆڤەوە دێت، سارتەر ئەوەمان پێ دەڵێت کە مرۆڤ سەرەتا بوونێکی هەیە، پاشان پێناسەی خۆی دەکات و شوناسی خۆی دەدۆزێتەوە، بەم جۆرەش بوون دەبێتە هۆکارێکی گرنگ بۆ ئەوەی کەسەکە بگات به جەوهەری خۆی. بیرۆکەی بنچینەیی بوون پشت بەوە دەبەستێت کە شوناسی مرۆڤ به هیچ جۆرێک له لایەن سرووشت و کولتوورەوە دیاری ناکرێت، بەڵکو گەر ورد سەیری بکەین ئەوە بوونی مرۆڤەکەیە کە شوناسەکەیمان بۆ دیاری دەکات. مرۆڤ بێ لەو دەرهاویشتەیەی کە له بوونی خۆی و ئازادییەوە بەرهەمی دەهێنێت، هیچی دیکە نییە. ئەوە ئازادییە، کە کانگەی هەموو جەوهەرەکانە و مرۆڤ بەبێ بوونی ناتوانێت بڕیاری خۆی بدات و ئەگەرەکان له بەرچاو بگرێت. هەموو کەس ماف و ئازادیی ئەوەی هەیە، کە له داهاتوودا ببێتە ئەو کەسەی کە خۆی دەیەوێت!

هەموو مرۆڤێک کە لەم جیهانەدا بوونی هەیە، ئامانجی ئەوەیە کە جەوهەر و ئامانجی ژیانی خۆی بدۆزێتەوە. لە پیرەمێرد و زەریادا چیرۆکی پیرەمێردێک دەخوێنینەوە، کە هەشتاوحەوت ڕۆژ هیچ ماسییەکی ڕاو نەکردووە، هەر بۆیەش دووبارە بە مەبەستی نێچیر و دەستکەوتێکی چەور، بەرەو پانتایی زەریا دەکەوێتەوە ڕێ، تاکوو لەوێ مارلینەکە ڕاو بکات و پاش سێ ڕۆژ لە کوشتنی، قرشەکان بە سەریدا بدەن و بەو جۆرەش بە دەستی خالی و ئێسکەپەیکەری ڕەقـوتەقی ماسییەکەوە بگەڕێتەوە. لەدەستدانی ماسییەکە لە خۆیدا کارەساتێکە بۆ پیرەمێردەکە، پاش ئەو سێ ڕۆژە تاقەتپڕوکێنەی کە چەند جارێکی کەمی لێ دەرچێت، هیچ پشوویەکی نادات. بەڵام لەبری ئەوەی تێک بشکێت و بە تەواوی کۆڵ بدات، دەگەڕێتەوە بۆ کوخەکەی و وەک هەمیشە خەون بە شێرەکانەوە دەبینێت. چیرۆکەکە تەنها پیرەمێردێک نیشان نادات کە بێهوودانە خەریکی ڕاوکردنی ماسییەکە، بەڵکو پرۆسەیەکی ژیان نیشان دەدات، کە پیرەمێردەکە لە ململانێدایە لەگەڵ خۆیدا، تا لەڕێی بار و پێشهاتە خوازراو و نەخوازراوەکانی بوونی خۆیەوە، بگات بە جەوهەری خۆی.

## پیرەمێرد و شانازیکردن بە خۆوە

سانتیاگۆی پیرەمێرد لە جیهاندا بوونی هەیە، بەپێی خواستەکانی، خودی خۆی لە قۆناغە جیاوازەکانی ژیانیدا هەڵبژاردووە و بەمەش گەیشتووە بە جەوهەری بوونی خۆی، کە لەڕێی پێکداچوون و جیاوازیکردنی بوون لە خۆیدا و بوون بۆ خۆیەوە ئەم ئەنجامە بەرهەم هاتووە. پیرەمێردەکە ئەم پێکداچوونانەش لەڕێی ئەو بڕیارانەی کە بەسەر خۆی و هاوڕێکەیدا سەپاندوونی، دەخاتە ڕوو.

### ئەو بڕیارانەی کە سەبارەت بە خۆی داونی

لە سەروو هەموو ئەو بڕیارانەوەی کە پیرەمێردەکە بۆ دۆزینەوەی جەوهەری خۆی بە هەندی وەرگرتن، ئەوەی کە ماسیگرێکی چاونەترس و کۆڵنەدەر بێت، سەرەکیترین و گرنگترینیانە. وەک لە ڕۆمانەکەدا باس کراوە، سانتیاگۆی پیر لە شارۆچکەیەکی نزیک زەریا دەژی و وەک هەر پیاوێکی دیکەی ئەوێ بڕیاری داوە لەسەر ماسیگرتن بژی، بەبێ گوێدانە تەمەنی و ئەو بەخت و پیرۆزییە کەمەی لە لایەن خوداوە پێی دراوە! هێمینگوەی تەمەنێکی دیاریکراوی نەداوەتە پیرەمێردەکە، بەڵکو زۆر بە سادەیی بە پیرەمێرد یان سانتیاگۆ بانگی دەکات. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە، کە لەڕێی سەرنجدانی برینەکان و کفتبوونی دەستییەوە، دەتوانین تەمەنەکەی دیاری بکەین و بگەینە ئەو بڕوایەی کە بە ڕاستی پیاوێکی پیرە! هێندە پیر کە ئیدی کەڵکی کاری قورسی نەمابێت، بە تایبەت

ماسیگرتن به تەنیا، که وزه و توانایەکی جەستەیی ئێجگار زۆر دەخوازێت. لەگەڵ ئەوەشدا پیرەمێردەکه پیشەی ڕاوەماسی وەک سەرچاوەیەک بۆ مانەوەی له ژیاندا هەڵبژارد، چونکه لەڕێی پێکداچوون و ناکۆکییەکانی ناخی خۆیەوە، توانیویەتی بوونێک بۆ خۆی، که ئەو بوونەیە مرۆڤ ئاواتەخوازە پێی بگات، لەو بوونەی که خۆی تێیدا ژیاوه بەدەست بهێنێت. گەر سەیری بوون له خۆیدای تایبەت به پیرەمێردەکه بکەین، دەبینین که تەنها ویستویەتی بەرەو زەریا مل بنێت و خەریکی ڕاوەماسیی خۆی بێت تا ئەو کاتەی سەر دەنێتەوه و دەمرێت. هەڵبەت ئەمەش بوونێکه که تەواو شیاوه و لەگەڵ بەهای ژیانی ڕاستەقینەی خۆی و ئەو کارانەی که کردوونی و ئەوەشی که هەرگیز هیوای تووشی نەبووه، دێتەوه.

له سەرەتای چیرۆکەکەدا وا دەردەکەوێت، که پیرەمێردەکه به تەواوی بێبەش بووبێت له پیرۆزی و بەخشندەیی خوا. گوندنشینەکانی دیکەش، وەک ئاماژەیەکی بەدبەختی له پیرەمێردەکه دەڕوانن و تا بتوانن لێی دوور دەکەونەوه. تەنانەت ڕێگریشیان له هاوڕێکەی، که کوڕەکەیه، کرد تاکوو واز لەو بهێنێت و بچێت له بەلەمێکی دیکەدا دەستبەکار بێت. هەموو ئەمانه بەشێک بوون لەو بوون له خۆیدایەی که پیرەمێردەکه هەیەتی: بەبێ ڕاوکردنی هیچ ماسییەک، بێبەخت، بێ ئەوەی کەس دەستی یارمەتیی بۆ درێژ بکات. ئەمه له کاتێکدا که پیرەمێردەکه هێشتا سووره لەسەر ئەوەی به تەنیا دەست به ڕاوکردن بکاتەوه. هەر بۆیه بۆ بەیانیی ڕۆژی دواتر دەکەوێتەوه ڕێ تا ببێته ئەو ماسیگرەی که هەمیشه له ئاگایی خۆیدا بوونی هەبووه، بێ گوێدانه ئەوەی که چەندێک بپیره و

ماسیگرتن بە تەنیا، کە وزە و توانایەکی جەستەیی ئێجگار زۆر دەخوازێت. لەگەڵ ئەوەشدا پیرەمێردەکە پیشەی ڕاوەماسی وەک سەرچاوەیەک بۆ مانەوەی لە ژیاندا هەڵبژارد، چونکە لەڕێی پێکداچوون و ناکۆکییەکانی ناخی خۆیەوە، توانیویەتی بوونێک بۆ خۆی، کە ئەو بوونەیە مرۆڤ ئاواتەخوازە پێی بگات، لەو بوونەی کە خۆی تێیدا ژیاوە بەدەست بهێنێت. گەر سەیری بوون لە خۆیدای تایبەت بە پیرەمێردەکە بکەین، دەبینین کە تەنها ویستویەتی بەرەو زەریا مل بنێت و خەریکی ڕاوەماسیی خۆی بێت تا ئەو کاتەی سەر دەنێتەوە و دەمرێت. هەڵبەت ئەمەش بوونێکە کە تەواو شیاوە و لەگەڵ بەهای ژیانی ڕاستەقینەی خۆی و ئەو کارانەی کە کردوونی و ئەوەشی کە هەرگیز هیوای تووشی نەبووە، دێتەوە.

لە سەرەتای چیرۆکەکەدا وا دەردەکەوێت، کە پیرەمێردەکە بە تەواوی بێبەش بووبێت لە پیرۆزی و بەخشندەیی خوا. گوندنشینەکانی دیکەش، وەک ئاماژەیەکی بەدبەختی لە پیرەمێردەکە دەڕوانن و تا بتوانن لێی دوور دەکەونەوە. تەنانەت ڕێگریشیان لە هاوڕێکەی، کە کوڕەکەیە، کرد تاکوو واز لەو بهێنێت و بچێت لە بەلەمێکی دیکەدا دەستبەکار بێت. هەموو ئەمانە بەشێک بوون لەو بوون لە خۆیدایەی کە پیرەمێردەکە هەیەتی: بەبێ ڕاوکردنی هیچ ماسییەک، بێبەخت، بێ ئەوەی کەس دەستی یارمەتیی بۆ درێژ بکات. ئەمە لە کاتێکدا کە پیرەمێردەکە هێشتا سوورە لەسەر ئەوەی بە تەنیا دەست بە ڕاوکردن بکاتەوە. هەر بۆیە بۆ بەیانیی ڕۆژی دواتر دەکەوێتەوە ڕێ تا ببێتە ئەو ماسیگرەی کە هەمیشە لە ئاگایی خۆیدا بوونی هەبووە، بێ گوێدانە ئەوەی کە چەندێک بپیرە و

چەندە ئازاری چەشتووە. هەر لەبەر ئەمەش، چالاک و بەهێز، بە ورەیەکی بەرزەوە سواری بەلەمەکەی دەبێت و دەکەوێتە ڕێ، تا لەڕێی ئەو بوونەی کە لەو ساتەدا هەیەتی، بگات بەو بوونەی کە خۆی دەیەوێت. لەو پێکداچوون و ناکۆکیانەی کە لەگەڵ خۆیدا هەیبوون، پیرەمێردەکە بڕیاری دا وەک ماسیگر بمێنێتەوە و، لەڕێی چالاکییەکانی خۆیەوە توانیی بەشێک لە جەوهەری بوونی خۆی بدۆزێتەوە. بە وردبوونەوە لە ئاگایی بوونی خۆی، پیرەمێردەکە خۆی لێوڕێژ کرد لە هێز و ویستی کۆڵنەدان، چونکە تەنها بەم جۆرە دەتوانێت ببێت بەو ماسیگرەی کە خۆی لە مێشکیدا دایناوە. خۆشبەختانە توانیی بوونی خۆی و ئەو بوونەی کە دەیەوێت پێی بگات، بەیەکەوە گرێ بدات، دروست لەو کاتەدا کە دەڵێت: «مرۆڤ بۆ ئەوە نەئافرێندراوە کە ببەزێت. دەکرێ تێک بشکێت، وەلێ هەرگیز نابەزێت.» هەر بۆیەش بە هەموو توانا و گوڕوتینی خۆیەوە تا دوا خولەکی هەلاهەلابوونی گۆشتی جوانی ماسییەکە شەڕی کرد و کۆڵی نەدا.

گوتراوە کە خەون ڕەنگدانەوەی بیرۆکەکانی دەروونی مرۆڤە. بەپێی دەروونشیکاریی فرۆید، خەون بەرجەستکردنی نائاگایی مرۆڤە. لە چیرۆکەکەدا پیرەمێردەکە جگە لە شێرەکان، خەونی بە هیچ شتێکی دیکەوە نەدەبینی. ئەو کاتانەی کە هەستی بە تەنیایی و شەکەتی دەکرد و پێویستی بە هاندەرێک بوو، ئاواتی دەخواست کە خەوی لێ بکەوێت و خەون بە شێرەکانەوە ببینێت. لە کۆتایی چیرۆکەکەشدا و ئەو ساتەی پیرەمێردەکە لە زەریا دەگەڕێتەوە، خەوی لێ دەکەوێت و دووبارە خەون بە شێرەکانەوە دەبینێت! خەونبینینی

بەردەوامی پیرەمێردەکە بە شێرەکانەوە، پەردە لەسەر ئەو ڕاستییە هەڵدەماڵێت کە پیرەمێردەکە دەیەوێت وەک شێرەکان بژی. شێرەکان ئاماژەیەکن بۆ باری ڕۆحیی پیرەمێردەکە. بە یارمەتی ویست و ڕۆحێکی نەبەزیو و کارکردنێکی زۆر و قورس، توانیی شکۆ و ڕێزی خۆی لەنێو ماسیگرەکانی دیکەدا بگەڕێنێتەوە. لە لاپەڕەکانی سەرەتادا باس لەوە دەکرێت کە پیرەمێردەکە بە هۆی بەدبەختیی خۆیەوە، بووەتە بنێشتە خۆشەی سەر زاری ماسیگرەکانی دیکە، بەڵام لەبری ئەوەی پێی ناخۆش بێت و بەرپەرچیان بداتەوە، گێڕەرەوە پێمان دەڵێت کە پیرەمێردەکە بە بای خەیاڵیدا نەدەهات و خەیاڵی نیشتبووەوە سەر ڕۆژانی ڕابردووی تەمەنی. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ژیانە پڕ ئاسۆر و دژوارەی کە پیرەمێردەکە پێیدا گوزەری کردووە، هەرگیز هەستی بە شکان، یاخود شەرم و تەریقبوونەوە، دەرهەق بە گاڵتە و توانج و قسەی ماسیگرانی دیکە نەکردووە. بە بڕوا و شانازییەکی زۆرەوە، پیرەمێردەکە بەرەو پانتایی زەریا دەڕوات، تا لەوێ ماسییەکە ڕاو بکات و دواتر تەنها ئێسکەپەیکەرەکەی بهێنێتەوە کەنار زەریا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە ماسییەکەی لەدەست دا، توانیی ڕێزی خۆی بگەڕێنێتەوە و دووبارە لەنێو ماسیگرانی شارۆچکەکەیدا توانای خۆی بسەلمێنێتەوە. لەو ڕۆژانەدا کە دیار نامێنێت و لە زەریا دەبێت، خەڵکی ناوچەکە بە شوێنیدا دەگەڕێن و کە دەشگەڕێتەوە بەندەرەکە، کەلوپەل و بەلەمەکەی دەسپێرێتە پێریکۆ. لە کۆتاییدا، لەڕێی ئەو بڕیارانەی کە پیرەمێردەکە پەیوەست بە ژیانی خۆیەوە داین،

توانیی بەرگێکی شەرمەنانە و وێنەیەکی نەبەزیو بە بەر بوونی خۆیدا بکاتەوە.

## هەڵبژاردنی کوڕەکە وەک هاوڕێیەک لە لایەن پیرەمێردەکەوە

هەموو کەسێک وێنەیەک سەبارەت بە برادەر لە ئاگاییدایە، کە لەو بڕوایەدایە ئەو کەسەی دەبێتە برادەری، پێویستە بەو جۆرە بێت. هاوڕێ ئەو کەسەیە، کە مرۆڤ حەز و خولیا و بڕوا و هەستەکانیی لەگەڵدا دەگۆڕێتەوە. ئەو کەسەیە کە تەنها لە ساتەوەختی بوونی کەسەکەدا ئامادەگی نییە، بەڵکوو بەشێکیشە لەو داهاتوویەی کە دەیەوێت پێی بگات. هەڵبژاردنی هاوڕێ، لە زۆر باردا دەرئەنجامی ناکۆکی و پێکداچوونەکانی ناخی مرۆڤە. پیرەمێردەکەش مانۆلینی لەو شارۆچکەیەدا هەڵبژارد، کە تەنها گرنگییەکەی لەوەدا نەبوو کە بتوانێت قسەی لەگەڵدا بکات، بەڵکوو کوڕەکە دەتوانێت یارمەتیی بدات و پێکەوە دەستەیەک دروست بکەن و لە هەموویشی گرنگتر، پێناسە و شوناسێک دەبەخشێتە پیرەمێردەکە. گوتەیەکی چینیی کۆن هەیە کە دەڵێت، مرۆڤ دەکرێ لە ڕێی هاوڕێکەیەوە بناسرێتەوە. کەسایەتیی هاوڕێ، بە جۆرێک لە جۆرەکان ڕەنگدانەوەی ناخی ئەو کەسەیە کە هەڵی بژاردووە.

پیرەمێردەکە کوڕێژگەیەکی هەڵبژارد، کە لە تەمەن و ئەزموونـدا لە یەکتر جیاواز بوون. وەک هاوڕێیەک فێری شتگەلێکی زۆری کرد، پێکەوە قسەیان دەکرد و پیرەمێردەکە بڕوای پێی هەبوو. هەر بۆیەش کاتێک لە یەکتری دادەبڕین، پیرەمێردەکە دەکەوێتە گۆمێکی قوڵی خەم و پەژارە و هەستی

ەنیـــایی. کاتێـــک دووردوور لە زەریـــادا لەگەڵ ماســـیيەکە
.ەکەوێـتە ململانـێ، چەنـدین جـار خـۆی دەدوێنـێ و ئـاوات
.ەخوازێـت کە کـوڕەکەی لەلا بـووایە تـا کەمێـک بیدوانـدایە.
کوڕەکە و پیرەمێرد ئەو کاتەی ڕەوەماسی دەکەن، هەستێکی
هاوبەشـیان هەیە. کاتێـک جارێکیـان مـارلینێکی مێیـان، لە
جـووتێکی نێـر و مـێ ڕاوکـرد، حـاڵەتی نائـارام و لێـوڕێژ لە
پەژارەی دەروونـی مـارلینە نێرەکەیان دەبینـێ، کە ناچـار و بێ
ئەوەی بژاردەیەکی دیکەی هەبێت، دەبوو بەلەمەکە جێ بهێڵێت.
لەو کـاتەدا «پیرەمێـردەکە بیـری کـردوە: ئەوە ناخۆشـترین
ڕووداو بـــووە کە لەگەڵ مارلینەکانـــدا ئەزمـــوونم کردبـــێ.
کـوڕەکەش بە هەمـان شـێوە دڵگـران بـوو.» ڕەنـگە ئەمەش،
ئەوەمان بۆ ڕوون بکـاتەوە کە بۆچی بوونە هـاوڕێی یەکتری.
چونکە دەرکیان بە هەمان هەست و ئەزموونی هاوبەش دەکرد
لەگەڵ یەکدیـــدا. پیرەمێـــردەکە بەوەی کە لەگەڵ کـــوڕێکی
چـاونەترس و بوێردایە، زیـاتر بەر بوون و کەسایەتیی خـۆی
دەکەوتەوە! لەگەڵ کـوڕەکەدا، پیرەمێـردەکە لەڕێـی گەیشـتن بە
جەوهەری خۆی، تەنیا نەبوو و هـاودەمێکی ڕۆحیی هەبوو.

ململانێ دەروونییەکان و ئەو بوونەی کە دەیویست پێی بگات،
پیرەمێردەکەیـان کـردە ئەو کەســەی کە خـۆی دەیویسـت و
بوونی ئەویان لەڕێی ئەو هەڵبژاردە و بڕیارانەوە خستە ڕوو
کە سـەبارەت بە خـۆی و هـاوڕێکەی دەیـدان. هەمـوو ئەو
بڕیـارانەی کە پەیوەسـت بـوون بە: ئەوەی کە ببێـتە ماسـیگر،
خەونـی شـێرەکان، هێشـتنەوەی شـکۆ و ڕێـز، بـوونە هـاوڕێی
مانۆلین.

## ئازادیی کوڕەکە لەبەرانبەر خۆیدا

لە دیدگەی فەیلەسوفانی بوونگەراوە، ئاگایی کەسێک بەرانبەر یەکێکی دیکە، تەواو ئاگاییەکەی ئازادە. لە واقیعیشدا، دەکرێ ئەو هەڵچوون و گۆرانکارییە خێرایەی کە بەسەر ئاگاییدا دێ، لەرێی ئەو بڕیارانەوەی کە دەدرێن ڕوون بکرێتەوە. دەبێ بڵێین کە هەموو کەس ئازادە لەوەی کە بیەوێت لە داهاتوودا ببێت بە چی! جیا لەو سنووردارییەی کە مانۆلین هەیبوو، بە هاوکاری لەگەڵ ئاگایی خۆیدا توانیی بڕیار بدات کە دەیەوێت ببێت بە چی.

ئەو بڕیار و هەڵبژاردنەی کە کوڕەکە دایین، کەسایەتیی کوڕەکەیان ڕوون کردەوە. قسە و کرداری بە جۆرێک لە جۆرەکان پەردەیان لەسەر لایەکی بوونی ئەو هەڵماڵی. ئیدی لەو کاتەوەی کە پیرەمێردەکە بۆ ماوەی هەشتاوچوار ڕۆژ هیچ ماسییەکی ڕاو نەکردبوو، دایبابی فرمانیان پێ کرد کە لە بەلەمێکی دیکەی بەبەختدا کار بکات. کوڕەکە بڕیاری دا کە شوێن بڕیاری دایبابی بکەوێت و بەمەش خۆی وەک کوڕێکی گوێڕایەڵ لای ئەوان ناساند. بەڵام لە کاتێکدا کە نەیدەتوانی لەگەڵ سانتیاگۆ بچێتەوە ڕاو، درێغیی نەدەکرد لە یارمەتیدانی و بەمەش وەفای خۆی وەک هاوڕێیەک نیشان دا. چونکە کاتێک کوڕەکە زانیی کە پیرەمێردەکە هیچ خۆراکێکی نییە بیخوات، ڕۆیشت و ژەمەخۆراکێکی بۆ هێنا، چونکە دەیزانی بەیانی دەچێتە ڕاو.

لەڕێی بڕیارەکانیەوە، کوڕەکە هەم وەک هاوڕێیەک، هەمیش وەک کوڕێکی گوێڕایەڵی دایبابی خۆی، بە شوناس و ناسنامەی خۆی ئاشنا بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ناسنامانە دژ بە یەکیەکیان تێدا بەدی دەکرێت، کە ئەمەش واقیعی کوڕەکەی هێنایە ئاراوە! وەک سارتەر دەڵێ: «واقیعی ئازادی، ئەو ڕاستییەیە کە ئازادی ناکرێ ئازاد بێت!» کوڕەکە هەموو کات ئازاد نەبوو کە ئەو شتە هەڵبژێرێت کە خۆی دەیەوێت. لە کاتێکدا کوڕەکە لە کۆمەڵگەیەکدا و لەگەڵ خێزانەکەیدا دەژیا، واقیعییەتێکی دەربارەی ئازادی هەبوو. دەشیا بەلەمی پیرەمێردەکە جێ بهێڵێت و بچێت لە بەلەمێکی دیکەی بەبەختدا دەستبەکار بێت، بەو جۆرەی کە دایبابی دەیانخواست. ئەم بڕیارەشی بە پشت بەو کەسایەتییەی کە ئەوکات هەیبوو دا، نەک ئەوەی کە دواتر پێی دەگات. با ئەوەش لە بیر نەکەین کە لەو کاتەدا، مانۆلین ئەو کەسە نەبوو کە خۆی ئاواتی پێ دەخواست!

ماسیگرەکان و خێزانەکەی گومانیان بۆ کوڕەکە دروست دەکرد، کە کارێکی باش ناکات ئەگەر لەگەڵ پیرەمێردەکە بەردەوام بێت لە ڕاوکردن، هەر بۆیەش لەویان دوور خستەوە. لەو کاتەشدا، کوڕەکە بێ لەوەی ملکەچیان بێت، هیچ ڕێگەچارەیەکی دیکەی نەبوو. لە دیدگەیەکی بوونگەراییانەوە کوڕەکە بوونی خۆی پشتڕاستکردبووەوە و ملکەچی خێزانەکەی بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەتوانی یارمەتیی خۆی بدات لە دۆزینەوەی ئەو بوونەی کە دەیەوێت پێی بگات، چونکە هەردەم بەئاگا بوو لەوەی کە هاوڕێی پیرەمێردەکەیە و هەرگیزیش جێی ناهێڵێت. دوای ئەوەش کە پیرەمێردەکە

چووبووە زەریا، کورەکە زووزوو سەری لە کووخەکەی دەدا تا بزانیت گەڕاوەتەوە یان نا. ئەو کاتەشی کە پیرەمێردەکە گەڕایەوە، کورەکە بینیی کە هەناسە دەدات و دواتریش سەرنجی دەستەکانیی دا، خۆنەویستانە دایە پرمەی گریان. کورە بەو گریانەی، سنووردارییەکەی خۆی تێپەڕاند و لای روون بووەوە کە بە راستی چیی ویستووە. هەر بۆیەش بڕیاری خۆی دا و گوتی: «ئێستە، دووبارە پێکەوە ڕاو دەکەینەوە.» لەڕێی هەردوو جۆری بوون لە خۆیدا و بوون بۆ خۆی، کورەکە کەوتە ململانێ و پێکداچوون لەگەڵ بڕیارەکانی خۆیدا. دواجار لەڕێی ئەم بڕیارانەوە کورەکە بوونی خۆی دۆزییەوە و بوو بەو کەسەی کە ئاواتی بۆ دەخواست.

سەرچاوە:

Man's Interaction With Himself in The Old Man and the Sea, With the View of Existentialism.

Li Li-juan. Yibin University. Yibin City, China.

**"مرۆڤ دەکرێ تێک بشکێ،**
**وەلێ هەرگیز نابەزێنرێت "**

-ئێرنێست هێمنگوای -

# The Old Man and the Sea



**Ernest Hemingway**

**Translated By: Isa Osman**




**لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان**